# دەروازەیەک بۆ
# خودئەڤینی
# (نەرجسیەت)





زیگمۆند فرۆید
وەرگێڕانی: وەلید عومەر



زیگمۆند فرۆید

# دەروازەیەک بۆ «خودئەڤینی»

وەرگێڕانی

وەلید عومەر



# ناوەندی ڕۆشنبیریی ڕەهەند

(زنجیرەی دەروونشیکاری کتێبی ژمارە: ٥)

ناوی کتێب: دەروازەیەک بۆ "خودئەڤینی"
ناوی نووسەر: زیگمۆند فرۆید
ناوی وەرگێڕ: وەلید عومەر
بابەت: دەروونناسی
دیزاینی بەرگ: حەمەڕەش
دیزاینی تێکست: ڕەنجدەر جەبار
نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٢٠
چاپخانە: ناوەندی ڕەهەند
تیراژ: (٥٠٠) دانە
نرخ: (٢٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە ( )ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێ دراوە.

ناوەندی ڕۆشنبیریی ڕەهەند
سلێمانی - شەقامی مەولەوی - نزیک بەریدەکە - بەرامبەر گەراجی ئارا
07709309121
Ktebxanai Rahand

# پێشەکی

وا باسدەکرێت ئەمڕۆ لە سەردەمێکدا دەژین، خودئەڤینی قوڵپدەدات، یان بە دەربڕینێکی کەمێک ڕۆژانەیی: گشت خەڵک خۆپەرست بوون، مرۆڤی نەرجسی چواردەوری داوین. بۆیە گرنگیی ئەم بەرهەمەی فرۆید، دووجا و دووقاتە. بەشێکی لەوێوەیە کە بەپێی چەمکە دەروونشیکارییەکانی خۆی پرسەکە شرۆڤەدەکات و دیوێکی زانستیی پێدەبەخشێت، بەشێکی تریشی لەوێوەیە کە ئەمڕۆ بەشێوەیەکی کۆنکرێتی و بێپەردە ئەم دیاردەیە لەناو مرۆڤەکاندا بەدیدەکەین. وێڕای ئەمەش دەبێت هەر لەسەرەتاوە، وەک ئەگەرێکی ناو کەسایەتیی مرۆڤ سەیری چەمکەکە بکەین نەک ئەوەی پێمانوابێت دەتوانین بەڕەهایی دووریخەینەوە- هەر لەبەر ئەمەشە زۆرێک لە شاکارە جیاجیاکانی مێژووی مرۆڤ ڕیشەیان لەم چەمکەدایە و دەرهاویشتەی ئەم چەمکەن. وشەی «خۆپەرستی» بەرامبەر بە «خودئەڤینی» وشەیەکی زۆر دەقیق نیە، چونکە هەم کۆمەڵێک مانای پێشوەختەی وەرگرتووە کە داماڵینیان ئاسان نیە و دوای ئەوەش

"پەرستن" و "ئەڤین" بەتەواوی یەکسان نین بەیەکتر کە لە پاشکۆی هەردوو زاراوەکەدا هاتوون. لە زمانی باودا «ئەنانی»یش دەوترێت کە ئاشکرایە لە زمانی عەرەبییەوە هاتووەتە ناو کوردیی ڕۆژانەوە و وشەکە لە ئەنا(الانا) درووستبووە کە بە مانای من دێت و «ئەنانی»یش ئاماژەیە بۆ کەسێکی منپەرست و خودپەرست(گەرچی لە زمانی عەرەبیدا «النرجسية» جێگیربووە و هەر لە نارسیسیزمەوە گۆڕان بەسەر وشەکەدا هاتووە).

خودئەڤینی(نەرجسیەت یان نارسیسیزم: narcis-sism)، وەک ناو دەگەڕێتەوە بۆ نارسیس(نەرجس)ـی پاڵەوانی کۆنی یۆنانی کە ڕێی دەکەوێتە ناو دارستان و مێرگەلانێک و بەسەر کارێزێکدا شۆڕدەبێتەوە ئاوبخواتەوە، کەچی وێنەی خۆی لە ئاوەکەدا دەبینێت و هێند لێی وردەبێتەوە تا شەیدای دەبێت و دەکەوێتە ئەڤینەوە لەگەڵی. زاراوەی خودئەڤینی لەم تەمسیلەوە هاتووە. لێرەدا خۆت دەبیتە ئۆبێکتی ئەڤینی خۆت. ئەو وزە دەروونییەی بڕیارە بیدەیت بەویتر، هەڵیدەگەڕێنیتەوە بۆ ناو خۆت و عاشقی خۆت دەبیت. ئەم عاشقبوونەش عەشقێکی هێمن و هاوسەنگ نیە، بەڵکو لە دواسنوردا دەرەنجامی کوشندەی لێ دەکەوێتەوە بۆ کەسەکە: «بەپێی ئەوەی لە شیعرەکانی شاعیری ڕۆمی(ئۆڤید)دا هاتووە، نارسیسۆس لاوێکی قۆز و کەشخە بوو، و زۆرێکیش خۆزگەیان دەخواست پێی بگەن. کاتێک تەمەنی گەیشتە شانزەساڵی و باڵق بوو، باکی بە کەس نامێنێت و خەڵکێکی زۆر عاشقی خۆی دەکات. ڕۆژێک کچێک بەناوی ئیکۆ عاشقی وی دەبێت. ئیکۆ کچێکە خوداکان توانای قسەکردنیان بەو شێوەیەی مرۆڤ لێ

سەندووەتەوە. ئیکۆ تەنیا دەتوانێت بەشی کۆتایی ڕستەکان دووبارەبکاتەوە. بۆنمونە گەر یەکێک بیوتایە "کتێبەکەم کوانێ"، ئەویش دووبارەیدەکردەوە «کوانێ؟کوانێ؟کوانێ؟». ئەمڕۆش کاتێک دەڵێین ئەم وشانە ئیکۆ کرا، ئەوا مەبەستمان هەر لەم دووبارەکردنەوەی وشەکانە[1]. ئیکۆ بەقووڵی عاشقی نارسیسۆس دەبێت، بەڵام هەرچەند دوایدەکەوێت کەچی وەڵام وەرناگرێتەوە. ڕۆژێکیان نارسیسۆس، ئیکۆ دەبینێت و دەپرسێت: "کەس لەویایە؟"، ئیکۆش وەڵامدەداتەوە "لەویایە، لەویایە، لەویایە". کاتێک نارسیسۆس چاوی بە ئیکۆ دەبینێت، بە هەند وەریناگرێت. ئیکۆش لەعنەت دەنێرێت و دەڵێت: هیوام وایە ئەوەی بەسەر منتا هێنا کە عاشقتم، هەمان شت بەسەر خۆشتا بێت». هەر واشی لێدێت. ڕۆژێک نارسیسۆس لە ئاوەکە دەڕوانێت و وێنەی خۆی دەبینێت و وادەزانێت کەسێکی ترە کە ئەوەندە جوانە. هەوڵدەدات لە وێنەکەی نزیکبێتەوە، بەڵام دەکەوێتە ئاوەکەوە و نوقمدەبێت[2]». بەم پێیە، عاشقبوون بە خۆت، جۆرێکە لە دابڕان لە جیهان، یان لە چیرۆکەکەدا دابڕان لە ئیکۆ. مرۆڤی نەخۆش لێرەدا ئەو کەسەیە کە وزەی دەروونی هەموو لە ئیگۆی خۆیدا خەرجدەکات و خاڵیی دەکاتەوە و ناتوانێت عەشقی بۆ ئەویتر هەبێت. نەتوانینی عەشق، جۆرێکە لە گرفتاریی دەروونی. لای فرۆید و لە پەیوەندییدا بەم باسەوە، عەشق جۆرێکە لە خاکیبوون و نواندنی سادەیی. ئەوەی عاشق بێت، شتێک لە خودئەڤینییەکەی دادەشکێنێت و بەسەر دەرەوەدا

---

١. وشەی echo لە زمانی ئینگلیزیدا لەمڕۆدا هەمان مانای هەیە, دەنگدانەوە, زایەڵە و هتد- و

٢. وەرگیراو لە کۆڕیکی وەرگێڕی فارسیی کتێبەکە- و

پەخشیدەکاتەوە. یان لە سیاقێکی فراوانتر و زارەکییتردا وەک ئەوەی کورد لە سیاقێکی گشتییتردا دەیڵێت: «چاوت بە هیچدا هەڵنەیەت». «ئەوەی چاوی بە هیچدا هەڵنەیەت» گیرۆدەی خودئەڤینییەکی کوشندەیە و سەرەنجام خۆیشی خۆشناوێت. ڕەنگە لێرەوە سەرنجەکەی کارن هۆرنای وەک سەرنجێکی ورد بکەوێتەوە کە دەڵێت: «کەسی خودئەڤین لە خۆی و ئەوانیتریش نامۆیە، نە خۆی خۆشدەوێت و نە خەڵکیش». لە چیرۆکەکەی نارسیسدا، خنکانی ناو ئاوەکە گوزارشتە لە عاقیبەتی خودئەڤینی. زیادەڕۆیی لە خودئەڤینیدا، سەری **ئیگۆ** دەخوات. بۆیە دەتوانین بڵێین پرسی خودئەڤینی، پرسێکە لەمەڕ پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و جیهان، یان ئیگۆ و دونیای دەرەوە و هەڵبەزودابەزەکانی. بە مانایەکی تایبەتیش، کەسێک کە لیبیدۆی خۆی بهاوێتە سەر ئەویتر، ئەوا جۆرێک لە دیموکراسیەت پیادەدەکات و وزەکەی بە تاقی تەنیا بۆ خۆی پاواننناکات.

خودئەڤینی یەک زاراوەیە بەڵام وەک چەترێک زۆر گرفتی دەروونی لەخۆیدا کۆدەکاتەوە: «لە دەروونشیکاریدا ئەو دیاردانەی ناوی خودئەڤینییان بەسەردا بڕاوە هەمەڕەنگن، لەوانە: خۆبەزلزانی، غروور، دەسەڵاتخوازی، حەزێکی زۆر بۆ ستایش و خۆشویستران بەبێ ئەوەی توانستی خۆشویستنی ئەوانیترت هەبێت، خۆدوورگرتن لە خەڵک، ڕێزنەگرتن لە خۆت، ئایدیاڵ و خواستی داهێنەرانە، خەمخواردن لە تەندروستی و ڕواڵەتی خۆت و نەبوونی توانای فیکری...[٣]». کارن هۆرنای، ئەم دیاردە دەروونییەی خودئەڤینی لە دیاردەیەکی ئابوری نزیکدەکاتەوە و دەڵێت:

٣. کارن هورنای، ص٩٢

«هەڵاوسانی دەروونی هەروەکو هەڵاوسانی ئابوری وایە، واتە بانگەشەکردنی نرخێکی زۆرتر لە نرخە واقیعییەکە[٤]». ئەم هەڵاوسانە، وادەکات ڕێزلەخۆگرتن و خۆبەزلزانی وەک دوو دیاردەی تەوا لێک جیاببنەوە و جیاوازییەکە چۆنایەتی بن نەک چەندایەتی. واتە کەسەکە لە حاڵەتی خودئەڤینییدا توانای ڕێزگرتنی لە خۆ نامێنێت و تووشی هەڵاوسانێکی ساختە دەبێت.

بۆ تێگەیشتن لەم بەرهەمە دەبێت سەرنجمان لەسەر چەند چەمکێک چڕکەینەوە کە چەندین جار دووبارەدەبنەوە: لیبیدۆ، خاڵیبوونەوەی لیبیدۆیی، **لیبیدۆ-ئیگۆ**، لیبیدۆ-ئۆبێکت، ئیگۆ ئایدیاڵ(ئایدیاڵی ئیگۆ). ئەم چەمکانە لە چەمکە پسپۆڕییەکانی دەروونشیکاری‌ن و فرۆید بۆ شرۆڤەکردنی پرسی خودئەڤینی بەکاریاندەهێنێت. لێرەوە تێدەگەین باسەکە زۆریش باو و ڕۆژانەیی نیە، بەڵام پاش خوێندنەوەی بەرهەمەکە دەتوانین بیبەستین بە ژیانی ڕۆژانەمانەوە. زاراوەی لیبیدۆ لە تەواوی بەرهەمەکەدا هاتوچۆ دەکات، چونکە خودئەڤینی خۆی بریتییە لە جێگۆڕکێی لیبیدۆ لە دونیای دەرەوەوە بەرەو ناو ئیگۆ خۆی. کاتێک مرۆڤ لە دەرەوە ئۆبێکتێکی بۆ نارەخسێت و ناتوانێت لیبیدۆی خۆی بنێرێتە سەری، ئیتر لیبیدۆکە هەڵدەگەڕێتەوە بۆ سەر ئیگۆ. ئاشکرایە لیبیدۆ، وزەیەکی غەریزیی دەروونییە و ناوەڕۆکێکی سێکسییانەی هەیە. پەخشبوونەوەی ناتەندرووستی لیبیدۆ، چەندین گرێ و نەخۆشی درووستدەکات کە خودئەڤینی یەکێکە لەوانە. لەمرۆدا لەبری ئەوەی لیبیدۆ بنێرینە سەر ئەوانیتر وەک ئۆبێکت، کەچی هەڵیدەگێڕینەوە بۆ نێو خۆمان

٤. هەمان، ل٩٢

و ئیگۆی خۆمان دەخەینە ژێر فشارێکی بەرگەنەگیراوەوە. ئەوەی لە زمانی باودا پێی دەوترێت خۆبەزلزانی، لە زمانە پسپۆڕییەکەی فرۆیددا بریتییە لە تەوژمی لیبیدۆ بۆ سەر ئیگۆ.

لە مێژوودا چەندین فۆرمی خودئەڤینی دەناسینەوە کە ڕەنگە زۆر سەرنجمان نەچووبێتە سەری و فرۆید خۆیشی باسیکردوون: هۆمۆسێکسواڵ(هاوڕەگەزبازەکان) جۆرێکن لە کەسانی خودئەڤین کە لیبیدۆ و وزە دەروونی و سێکسییەکەی خۆیانیان بەرەو ڕەگەزەکەی ***خۆیان*** ئاراستەکردووە. لە ئوستورە و بیروباوەڕە کۆنەکانیشدا، مرۆڤە سەرەتاییەکان جۆرێک لە خودئەڤینییان هەبوو کە بەنیسبەت ئەمڕۆوە خودئەڤینییەکی خۆڕسک بووە نەک ئەخلاقی. چونکە ئەمڕۆ لەگەڵ چەمکی خودئەڤینیی‌دا، دەنگدانەوەیەکی ئەخلاقییش دروستدەبێت کە چەمکەکە بارگاوییە بە هەستێکی نەرێنی و ڕق و خۆبەزلزانی. مرۆڤە سەرەتاییەکان پێیانوابوو دەتوانن بە سیحر و ئەفسوون هەموو دونیای دەرەوە بخەنە خزمەتی خۆیانەوە و لیبیدۆی خۆیان نەنێرنە دەرەوە بۆ سەر ئۆبێکتێکی دەرەکی. منداڵانیش هەروەکو مرۆڤە سەرەتاییەکان، خودئەڤینییەکیان تیایە کە بەر لەوەی گوزارشت لە ئەخلاقیاتێکی نەرێنی بکات، ڕووداوێکی کرچوکاڵە و بەشێوەیەکی ساویلکانە پێیانوایە دونیا بۆ خزمەتی وان دروستبووە. فرۆید خۆی ئەم خودئەڤینییە ناودەنێت خودئەڤینیی سەرەتایی کە لیبیدۆ هەر لە ئیگۆی منداڵەکەدا کەڵەکەدەبێت و داوا غەریزییەکان و تێرکردنەکەیان دەرەنجامی ئەم خودئەڤینییەیە. کاتێکیش منداڵ وردەوردە لە شیر دەبڕدرێتەوە، ئیدی ئیگۆ-لیبیدۆ

وەردەچەرخێت بۆ ئۆبێکت-لیبیدۆ، واتە لە کەسەکە خۆیەوە وەردەچەرخێت بەرەو ئۆبێکتێکی دەرەکی. لێرەوە **خودئەڤینیی دووەم** دێتەکایەوە کە مرۆڤ بەجۆرێک لە جۆرەکان خۆی لەبیردەکات و کەمەندکێشی ئۆبێکتە دەرەکییەکان دەبێت.

هەمیشە لە کێشەی خودئەڤینییدا، خەسڵەتەکان بەشێوەیەکی دیالەکتیکی کاردەکەن. ئەوەی ***وادەردەخرێت***، جۆرێکی ترە. بۆنموونە، باوەڕبەخۆبوون لە خودئەڤینیدا ڕووی دەرەوەی ئەو ڕاستییەیە کە کەسەکە باوەڕی بە خۆی نیە و بگرە پڕە لە هەستی گوناهـ و دڵەڕاوکێ و شەرم و تەنانەت بێزهاتنەوە لە خۆ. زۆرجار ئەمە لە دیکتاتۆرەکاندا بەدیدەکرێت(بەتایبەت لە خۆرهەڵات)، کە خەریکی ***شاردنەوە***ن لەڕێگەی ***دەرخستنەوە*** یان خەریکی ***دەرخستنن*** بەهۆی ***شاردنەوە***وە. دەروونشیکاری، خۆی زانستی گرێدانی ئەم هەستە دژیەکانەیە بەیەکترەوە کە چەندە ئاسان وەردەگەڕێن بۆ یەکتری. بەتایبەت هەردوو هەستی ڕق و خۆشەویستی کە شاهەستی دیاری ناو ژیانی مرۆڤن. «گەر تۆزێک ئاگات لە دەروونشیکاری بێت ئەوا بەئاسانی تێدەگەیت ئەو کەسانەی لەخۆڕا ستایش و موجامەلەت دەکەن، زۆر ترسناکن. ئەم کەسانە هەر ئەوانەن کە لە کاتی گونجاودا کەسایەتیتان تیرۆردەکەن و ئەنواوئەشکاڵ تۆمەت و لەکەتان پێوە دەنێن. ستایشکردن و ئافەرینگۆیی زیادەڕۆیانە و تیرۆری کەسایەتی، دوو ڕووی یەک دراون. ئەسڵەن دەروونشیکاری زۆرێک لەو سنورانە هەڵدەگرێت کە لەنێوان هەستە بەڕواڵەت ناکۆکەکاندا هەن. بۆنموونە، خەڵکە ئاساییەکە پێیانوایە عەشق و ڕق پێکەوە کۆنابنەوە. لە دیدی ئەوانەوە، عەشق شتێکە و ڕقیش ئەنتی

تێزەکەیەتی. دەروونشیکاری ئەمەی قبوڵ نیە و عەشق دەتوانێت لەگەڵ ڕقدا کۆببێتەوە و هەڵیشکات[5]». بەم پێیە خودئەڤینی هێنانی جیهانە بۆ ناو تەنیایی خۆت، بەڵام بەبێ پەیوەندییەکی تەندرووست و کەمتازۆر هاوسەنگ. بەم پێیە، گەر خودئەڤینی بۆ ئاستی چەمکێکی تەواو تیۆری بەرزکەینەوە ئەوا بریتییە لە کۆکردنەوەی دوو دژ بەتەنیشت یەکەوە کە تەنیا هەلومەرجێکی دەوێت بۆ ئەوەی وەرگەڕێت بۆ یەکێکیان. وێڕای ئەمەش ڕێژەیەک لە خودئەڤینی لە مرۆڤدا زەروورە و عیزەتنەفسی دەپارێزێت. جاریش هەیە خودئەڤینی ڕۆڵی میکانیزمێکی بەرگریی دەروونی دەبینێت بۆ ئەوەی کەسەکە لە واقیعی دەرەکی هەڵبێت و بگەڕێتەوە ناو خۆی. واتە پرۆسەکە بەشێوەیەکی نەستەکی و ناخودئاگایانە ڕوودەدات و کەسەکە خۆی ئیرادەی بەسەریدا ناشکێت.

فرۆید بەر لەم بەرهەمە کە ساڵی ١٩١٤ نوسیی، پتر سەرنجی خستبووە سەر لیبیدۆ ئەو کاتەی کە بۆ ئۆبێکتێکی دەرەکی خەرجدەکرێت و خاڵیدەبێتەوە. «بۆنمونە، دەم دەیەوێت مەمک بگرێت، کۆم دەیەوێت خەمی ڕاگرتن یان دەردانی پیسایی هەیە، زەکەر دەیەوێت دەرگیری دایک بێت. واتە لیبیدۆ لە هەموو ئەمانەدا ئۆبێکتێکی لە دونیای دەرەوەوە هەیە و وزەکەی خۆی تێیاندا خاڵیدەکاتەوە. بەڵام باسە نوێیەکە لەویایە کە لیبیدۆ دەیەوێت شتێکی تریش

5. https://www.atnanews.ir/archives/193904/%D8%AE%D9%88%D8%AF%D8%B4%DB%8C%D9%81%D8%AA%DA%AF%DB%8C-%D8%A8%DB%8C%D9%85%D8%A7%D8%B1%DB%8C-%D8%A7%D8%AC%D8%AA%D9%85%D8%A7%D8%B9%DB%8C-%D8%B2%D9%85%D8%A7%D9%86%D9%87-%D9%85%D8%A7-%D8%A7/

بکات، بەردەوامیش بەخۆی دەڵێت گەر بڕیارە من ئەم مەمکە لە دەم بگرم و ئەم پاشەڕۆیە ڕاگرم ئەوا دەبێت سەرەتا منێک هەبێت کە بتوانم ئەم کارانەی پێ بکەم. هەروەکو دیکارت کە دەیوت ئەگەر بڕیار گومانبکەم ئەوا دەبێت منێک هەبێت بتوانم بەهۆیەوە گومانبکەم. سەیرکەن لەڕووی میتۆدۆلۆژییەوە ڕامانەکانی فرۆید و دیکارت چەندە لەیەکدەچن، واتە فرۆیدیش دەڵێت دەبێت سەرەتا منێک هەبێت تا دواتر بتوانێت دەست بەسەر دایکدا بگرێت، بۆیە دەبێت لیبیدۆکەمان خۆپارێزییەک بۆ ئیگۆ بڕەخسێنێت. بۆیە بەشێک لە وزەکە بۆ ئیگۆ خەرجدەبێت...بەشێکی تریشی ئەوەیە بۆنمونە بازبدەم و خواردنەکە هەڵگرم، لەکاتێکدا خەریکم بەتاسەوە دەڕۆم خواردنەکە هەڵگرم. دەبێت بەشێک لە لیبیدۆکەم ئاگای لە من بێت، ئەگینا دوور نیە لەپێناوی هەڵگرتنی خواردنەکەدا خۆم لە پەنجەرەکەوە هەڵدەم و ئەوسا ئیتر هیچ منێک یان ئیگۆیەک لەئارادا نابێت خواردنەکە سەرفبکات. بۆیە لەم بەرهەمەی فرۆیددا ئاماژەیەک بە چەمکی (ئیگۆ-لیبیدۆ) هەیە، واتە ئەو لیبیدۆیەی کە بۆ ئیگۆ تەرخانکراوە. **ئید** خۆی هەموو شتێک نیە، بۆیە ئەمە ئەو وزەیەیە کە بۆ ئیگۆ خەرجدەکرێت[6]». لێرەدا مەمک ئۆبێکتێکی دەرەکییە و خاڵیبوونەوەی لیبیدۆ لەودا ڕوودەدات، بەڵام ئەم خاڵیبوونەوەیە پێویستی بە منێک یان ئیگۆیەکە تا ئەرکەکە ڕاپەڕێنێت. لێرەدا هاوکێشە فەلسەفییەکەمان بیردەکەوێتەوە

6. http://ravanshenasinegaresh.blogfa.com/category/122/%D9%81%D8%B1%D9%88%DB%8C%D8%AF-%D9%88-%D8%AA%D8%A7%D8%B1%DB%8C%D8%AE-%D8%B1%D9%88%D8%A7%D9%86%DA%A9%D8%A7%D9%88%DB%8C-%D8%AF%DA%A9%D8%AA%D8%B1-%D8%B3%D8%B1%DA%AF%D9%84%D8%B2%D8%A7%DB%8C%DB%8C

که سوبێکت دەکەوێتە بەرامبەر ئۆبێکتەوە، (یان بەپێی کوردییە باوەکە خود دەکەوێتە بەرامبەر بابەتەوە)، وێڕای ئەو جیاوازییەی کە خودئەڤینی جۆرێکە لە زیادەڕۆیی لە یەکێکیاندا.

خودئەڤینی بەشێکە لە خەسڵەتی دەروونییمان، بۆیە شتێک نیە بە ژێستێکی ئەخلاقییەوە فڕێبدەین. ئۆتۆ کێرنبێرگ، دەروونناسی نەمسایی، وەک زۆر دەروونناسی تر، ئەم بەرهەمەی فرۆید بە بەرهەمێکی گەلێک گرنگ وەسفدەکات و حەوت تایبەتمەندی بۆ کەسی خودئەڤین دەژمێرێت کە پێنجیان لە بەرهەمەکەی فرۆیددا باسکراون. ئەو تایبەتمەندییانە بریتیین لە:

١. خودئەڤینی قۆناغێکە لە پەرەسەندن و کامڵبوونی دەروون.

٢. خودئەڤینی، قۆناغێکی هەرەگرنگە لە ژیانێکی عاشقانەی ڕێک و دەروونددروستانە و نۆرماڵ.

٣. خودئەڤینی، هۆکاری دینامیکیی زۆرێک لە تێکچوون و نۆرماڵنەبوونە دەروونییەکانە(وەک شیزۆفرینیا، لادانی سێکسی، هاوڕەگەزبازی، هایپۆکۆندریا).

٤. خودئەڤینی، لە ڕێکخستنی عیزەتینەفس و ڕێزلەخۆگرتندا ڕۆڵێکی کارای هەیە.

٥. خودئەڤینی، فاکتەری دروستبوونی *ئیگۆ ئایدیاڵە* و لەم ڕێگەیەوە دەبێتە دیوێک لە دیوەکانی دەروونناسیی جەماوەر.

ئەوەی لە کۆی ئەم خاڵانەدا هاوبەشە، و فرۆیدیش جەختی

لەسەر کردووەتەوە، ئەوەیە کە: مرۆڤەکان بە زەمینە و باگراوەندێکی خودئەڤینانەوە دێنەدونیاوە. بۆیە خودئەڤینیی سەرەتایی قۆناغێکە لە گەشەی مرۆڤ-منال. بە مانایەکی تر، خودئەڤینی قۆناغێکی گەشەی لیبیدۆیە لە مرۆڤدا. منال گەرچی خۆی گەورەدەبێت و فۆرمی تری خودئەڤینی تاقیدەکاتەوە، بەڵام هەر خۆیشی دەبێتە دەسمایەیەک بۆ خودئەڤینیی دایکوباوک. دایکوباوک منال وەک بیانوویەک دەبینن تا نەرجسیەتی خۆیان تێربکەن و کۆمەڵێک ئایدیال[7] بدەنەپاڵ منالەکە و منالەکە ببێتە مایەی قەرەبووکردنەوەی کۆمەڵێک کەموکورتی لە خۆیاندا. فرۆید لە بەرهەمەکەدا بە توانجەوە دەڵێت: ««جەنابی ئەوی منال»، هەر بەو جۆرەی سەردەمانێک ئێمەش وا سەیری خۆمانمان دەکرد. منال ئەو

٧. ئایدیال(ideal)، لە مانا باوەکەیدا، وەرگرتنی شتێکی نمونەیی و کاملە بۆ ئەوەی بیکەیتە مۆدێل و سەرمەشقی خۆت(جا ئەو شتە هەرچی بێت). واتە، شتێک لە دونیای دەرەوە ڕا دەبێتە پێوانەی پێرفێکتبوون بۆ تۆ. لەم بەرهەمەدا، ئایدیال هەم وەک وشەیەکی ئاسایی هاتووە، هەم وەک فرمانی ئایدیالیزەبوون و ئایدیالیزەکردنیش، بەتایبەت ئەو کاتەی کە بەراوردەکرێت بە زاراوەی بڵندبوونەوە: «بەئایدیاڵکردن و ئایدیالیزەبوون، پرۆسەیەکە ئۆبێکتەکانی ئارەزوو دەگرێتەخۆی. لەڕێگەی ئەم پرۆسەیەوە، ئۆبێکتی ئاماژەبۆکراو بەبێ ئەوەی گۆڕان بەسەر ماهیەتەکەیدا بێت، لە زەینی کەسەکەدا گەورە و باڵاوبڵند دەبێتەوە. بەئایدیاڵکردنیش هەم لە پانتایی لیبیدۆ-ئیگۆ و هەم لە پانتایی لیبیدۆ-ئۆبێکتیشدا لەئارادایە. بۆنمونە، زیادەڕۆیی سێکسی لە ئۆبێکتێکدا، بریتییە لە ئایدیالیزە و بەئایدیالکردنی ئەو ئۆبێکتە. دەتوانین لەو ڕووەوە هەردوو چەمکی بەئایدیاڵکردن و بڵندبوونەوە لێکدی جیاکەینەوە کە بڵندبوونەوە پەیوەندیی بە غەریزەوە هەیە و بەئایدیاڵکردنیش پەیوەندیی بە ئۆبێکتی ئارەزووەوە». ئایدیالیزەکردن واتە ئەو شتە بەبێ گۆڕانکاری، بۆ تۆ کامڵ دەردەکەوێت. بەڵام لە بڵندبوونەوەدا، نەست غەریزەکەی تۆ بەلاڕێدا دەبات و بە شێوەی تر تێریدەکات. وشەکە لەگەڵ زاراوەی ئیگۆ ئایدیاڵیشدا هاتووە، کە مەبەستی لەو ئایدیاڵەیە وا لە کۆمەڵگاوە وەریدەگرین و وزەی دەروونیی تیا خاڵیدەکەینەوە. فرۆید دواتر پەرە بەم زاراوەیە دەدات و دەیگۆڕێت بۆ سوپەرئیگۆ. ئیگۆ ئایدیال، جۆرێکە لە دروستکردنی ئایدیال کە ڕۆڵ و کارکردی خۆفریودان دەگێڕێت. (وەرگێڕ).

خەونە ئارەزوومەندانەیەی داکوباب دێنێتەدی کە هەرگیز نەهاتبوونەدی: لەجیاتیی باوکی، دەبێتە پیاوێکی گەورە و پاڵەوان و کچەی منالّکاریش لەگەڵ شازادەیەکدا زەواجدەکات، ئەویش بۆ قەرەبووکردنەوەی دۆخی درەنگکەوتووی دایکی». دیارە ئەم پرۆسەیەش هەروا بەئاسانی پرۆسەیەکی خودئاگایانە نیە و ڕیشەی جیاجیای لە نەستی مرۆڤدا هەیە. خودئەڤینی خۆی دیاردەیەکە بەر لەوەی بتوانین ڕووناکیی بخەینەسەر، ڕیشەی لە تاریکاییە(زۆرجار بێماناکان)ـی بوونماندایە. واتە شتێک نیە دانیشین و بە پلان بڵێین ئەمەین یان ئەوەین و بەو جۆرە دەجووڵێینەوە.

کاتێک لە مەسەلەی خودئەڤینییدا، ئیگۆ دەبێتە کانگای لیبیدۆ، ئەوا ئەو ئایدیایەمان لا درووستدەبێت کە قەرزێکی ترسناکمان لای خۆمان هەڵگرتووە و دەبێت بزانین چۆن دەیدەینەوە یان چۆن خەرجیدەکەین. لە ئاستە قووڵە تیۆرییەکەیدا، وەکبڵێی لیبیدۆ و وزەی دەروونی هی ئێمە نیە، قەرزێکە تا ئەو دەمەی هەین کاری پێ دەکەین، پەیوەندیی خۆمانی بە جیهانەوە پێ ڕێکدەخەین. هەر تێکچوونێکی دیار لەم کارپێکردنەدا، بە تێکچوونی کارکردی کۆئەندامی دەروونی کۆتاییدێت. ئەم قەرزە لەبنەڕەتدا شەخسییە و هەرکەسە پشکی خۆی هەڵگرتووە، بەڵام بە نێوانگریی کۆمەڵگا و شارستانیەت کاردەکات و ئێمە لەپەیوەندییدا بەوانیترەوە لیبیدۆ خاڵیدەکەینەوە و مامەڵەی پێ دەکەین. دوا مۆرک کە لە کەسایەتی و کۆئەندامی دەروونییمان دەدرێت هی خۆمانە، بەڵام بە کۆمەڵێک ختووە و هەنگاوی پێچاوپێچدا دەگاتەوە سەر خۆمان. خودئەڤینی بەم مانایە، هەم نیشتەجێبوونە لە جیهاندا و هەم سڵکردنەوەشە لێی.

ئیدی دەتوانین ئەم جیهانە وردکەینەوە بۆ ئاستی کۆمەڵگا و جڤات و مەحفەلێکی چکۆلەش: دەزگا جیاجیا مادی و مەعنەوییەکانی ناو کۆمەڵگا ڕۆڵیان هەیە لە پەخشکردنی لیبیدۆ دەروونییەکەی ئێمەدا و کەم نین ئەو ساتەوەختانەی کە ئێمە بەپێی نیگای ئەو دەزگایانە هەڵوێست وەردەگرین-سا خودئەڤین بین یان کەسێک کە عیزەتی نەفس و ساغڵەمیی ئیگۆمان دۆڕاندبێت. کۆمەڵگاش وەکو سەردەمەکان لە گۆڕاندایە، لانیکەم بایی ئەوەی کە وەرچەرخانی دەروونی بەسەر تاکەکاندا بێنێت. بۆیە ئەمڕۆ لە سایەی ئەم گۆڕانانەدایە کە باس لە کەلتوری خودئەڤینی دەکرێت. دیارترین نمونەش کتێبەکەی نوسەری ئەمریکی «کریستۆفەر لاش»ـە بەناوی کەلتوری خودئەڤینی(the culture of narcissism). ئەم کتێبە ساڵی ١٩٧٩ بڵاوکراوەتەوە و تایتڵی دووەمی کتێبەکە دەریدەخات نوسەر دەرگیری ژیانی ئەمریکییەکانە: **ژیانی ئەمریکی لە سەردەمی کەمبوونەوەی چاوەڕوانییەکاندا.** نوسەر کێشە جیهانییەکان و ئەو کێشانەشی کە یەخەی ئەمریکای گرتووە لە ساڵانی پەنجا و شەست بەدواوە، بە سەرچاوەی جۆرێک لە خودئەڤینی دەزانێت. بەڵام وەک ئەوەی هەندێک لێکۆڵەر باسیدەکەن، ئەم خودئەڤینییە شتێک جیایە لەو خودئەڤینییە دەقاودەقەی کە فرۆید باسیدەکات. ئەم خودئەڤینییە کە یەخەی خەڵکی ئەمریکا و جیهانی گرتووە، لەبری دروستکردنی خۆخۆشویستن، سوبێکتێکی مردەڵە و بێئامانجی دروستکردووە. سوبێکتێک کە کەوتووەتە بەردەم قەپاڵی دەزگا بیرۆکراسییە زەبەلاحەکان، ئەو دەزگایانەی کە نەفەسێکیان بۆ سوپەرئیگۆ کۆنەکە نەهێشتووەتەوە و جۆرێک لە بونیادی نوێی سوپەرئیگۆیان

داڕشتووە. ڕەنگە پەنابردن بۆ سرووتەکانی وەک یۆگا، دەستشۆردنی مرۆڤەکان بێت لەوەی بتوانن هیوایەکیان بە خودئەڤینیش هەبێت. وەکبڵێی ئاگاهاتنەوە لە خودئەڤینی، چیدی بەرگەناگیرێت. ئەمەش بە ڕێگەیەک لە ڕێگاکان، دەمانباتەوە سەر ئەو تەفسیرانەی کە پێیانوایە چیدی کۆپەیوەندییە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتییەکان جێیەکی ئەوتۆ بۆ خودسازی و دەرکەوتنی ئیگۆی شەخسی ناهێڵنەوە. یان بۆنمونە خودئەڤینی خۆی دیاردەیەکی وێنەییە و مرۆڤ دەکەوێتە ململانێوە لەگەڵ وێنەی خۆی و دەرەوەی خۆیدا، بەڵام بەپێی نوسەر ئەمڕۆ بەهۆی فیچقەکردنی وێنەکانەوە بە هەموو ماناکانی، دنەی تایپێک لە خودئەڤینیی مۆدێرن دەدرێت و ئەمەش نەخۆشییەکی کەلتوری و کۆمەڵایەتی درووستدەکات و «تاکی ساغ» لەم نێوەندەدا وندەبێت. بەڵام نابێت ئەو ڕاستییەمان بیربچێتەوە کە تیۆرەکەی فرۆید بەو بەهێزیەی خۆیەوە ماوەتەوە و لەم پاشاگەردانییەی ئەمڕۆشدا زۆرینە هەوڵدەدەن بڵێن: ماوین، ئێمەش هەین، بەشی خۆمان ئەڤینمان بۆ خۆمان هەیە، و هتد. بگرە ستراتیژەکانی ملشکاندن و فێڵ و گزی، لە زۆربووندان و گەر بەشێوەیەکی تەندرووستیش نەبێت لیبیدۆ بۆ سەر ئۆبێکتەکانی دەرەوە دەگوازینەوە، ئەوا هێشتا لە کێشمەکێشێکی سەختداین بۆ ئەوەی وەک تاک و سوبێکت ون نەبین.

سەرەنجام، خودئەڤینی لەڕووی زاراوە پسپۆڕییەکانەوە، پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە چەمکی خاڵیبوونەوەی وزەی دەروونییەوە هەیە. **خاڵیبوونەوەی وزەی دەروونی** (ca-thexis) چیە؟ ئەم زاراوەیە لە بەرهەمەکانی فرۆیددا،

بەشێوەیەکی بەرفراوان بەکاردێت و دەتوانین زاراوەکە بە خەرجکردن و سەرفکردنیش وەرگێڕین. سەیرنەبێت کە زاراوەکە، جۆرێک مامەڵە و بێنەوبەردەی دەروونییە لەگەڵ ژیاندا. زاراوەکە گوزارشتە لە خاڵیبوونەوەی لیبیدۆ یان وزەی دەروونی لە مرۆڤدا، خاڵیبوونەوەیەک کە دیارە بۆ سەر شتێکە جا ئەو شتە خواستێک بێت، خەیاڵاتێک بێت، کەسێک بێت، ئامانجێکی تاک یان کۆ بێت، مەعشووقێک بێت، بیرێک بێت یان بگرە ئیگۆی مرۆڤ خۆیشی بێت. دیارە وزەی دەروونی، لەبنەڕەتدا لە ئیددا نیشتەجێیە و ناواخنێکی سێکسییانەی هەیە بۆیە زۆرجار فرۆید بە سێکسیبوون تۆمەتباردەکرێت. سێکسیبوونەکە، پێشوەختە و پەرشوبڵاوە و تەنیا یەم ڕێڕەوی سێکسییانەی نیە خۆی پێ خاڵیکاتەوە، بەڵکو بێشومار ڕێگە هەیە بۆ ئەوەی مرۆڤ ئەم وزە دەروونییە ***سێکسبارەی*** تیا خاڵیکاتەوە. مرۆڤ بەردەوام وەک زیندەوەرێک خەریکی بەرهەمهێنانی وزەی دەروونییە، بەڵام هەردەم و هەمووکات ئەم وزەیە ناداتەدەرەوە. بۆیە یەکێک لە ڕەهەندەکانی ئەم زاراوەیە، بریتییە لە سەرمایەگوزاریی دەروونی، واتە دەروون وزە ئەمباردەکات بۆ ئەوەی لە شوێنکانی تردا خاڵیبکاتەوە. خاڵیبوونەوەکە، ڕاستەوخۆ نیە، بەڵکو بە فلتەری ئیگۆ و سوپەرئیگۆدایە. ڕەنگە ئید وزەکە بۆ کردەیەکی سەمەرە بنێرێت، بەڵام ئیگۆ ڕێڕەوەکەی بگۆڕێت و بیخاتە خزمەتی چالاکییەکی ترەوە. واتە مادام ئید، سنوری باشە و خراپە یان واقیع و غەریزە نافامێت، ئیتر ئیگۆ ڕێگری لە خاڵیبوونەوە چەوتەکە دەکات و لێرەشەوە زاراوەیەکی هاولف دێتەکایەوە بەناوی دژەخاڵیبوونەوە(anticathexis). ئەو چەپاندنەی

وا دەممان پێی ڕاهاتووە، ناسراوترین دەرکەوتەی «دژەخاڵیبوونەوە»یە و ناهێڵێت وزە دەروونییەکە بەشێوەی زیانبەخش خەرجببێت و خاڵی ببێتەوە. فرمانی خاڵیبوونەوە، ڕەنگە بۆ زاراوەی تریش بەکاربهێنرێت بەڵام پێناچێت هیچیان وەک ئەم زاراوەیەی دەروونشیکاریی فرۆید سەرەکی بن. «خاڵیبوونەوە» لەو وێنا باوەش فراوانتر و ئاڵۆزترە کە دەوترێت «فلان کەس لە فلان شتا خۆی خاڵیکردەوە». بۆیە پرۆسەکە لە مرۆڤدا نەستەکییە و زۆرجار بەو شێوەیە ئاشکرا نیە. هەروەها «خاڵیبوونەوە» هەڵگری ڕەهەندی بارگاویبوون و کۆکردنەوەی وزەشە، بەڵام لەو ساتەدا کە دەهاوێژرێتە سەر بابەتەکەی خۆی. مرۆڤ زۆر خۆی پێ بالایە، بەڵام بەپێی ئەم زاراوەیە هەندێک لێکچوونی لەگەڵ مەکینەی هەڵمدا هەیە(چونکە هەردووکیان وزە دەردەدەن و زۆرجاریش وزەکە قەتیسدەبێت و لە جێی تردا فیشکەدەکات و کەتن دەنێتەوە). بەم پێیە، خودئەڤینی جۆرێک لە پەیوەندییە بە خاڵیبوونەوەی لیبیدۆ و وزەی دەروونییەوە، مامەڵەیەک کە زۆرجار وەک سیناریۆیەکی دەروونی لە دەرەوەی «ئێمە»وە دەگوزەرێت.

**وەرگێڕ**

# یەک

زاراوەی خودئەڤینی(نەرجسیەت)، ڕیشەی دەچێتەوە سەر وەسفە کلینیکییەکان کە [یەکەمجار] پۆڵ ناک[8] لە ساڵی ١٨٩٩ بۆ ئاماژەکردن بەو کەسانە بەکاریهێنا کە بەجۆرێک مامەڵە بە لەشی خۆیانەوە دەکەن کە هەر بەو جۆرەش مامەڵە بە ئۆبێکتێکی سێکسییەوە دەکرێت. بە دەربڕینێکی تر، ئەم کەسانە دەڕواننە لەشی خۆیان و نەوازشیدەکەن تا لەم ڕێگەیەوە دەستیان بە تێربوونی تەواوەتی بگات. زاراوەی خودئەڤینی، بەپێی ئەم شەرح و شرۆڤەیە، دەلالەت لە جۆرێک لادان[9]دەکات کە سەرلەبەری ژیانی سێکسیی کەسەکە بەرەو لای خۆی کێشدەکات و لە قۆناغەکانی دواتردا کۆمەڵێک تایبەتمەندی قوتدەکاتەوە کە لە لێکۆڵینەوەی هەموو جۆرەکانی لاداندا بەریدەکەوین.

8. Paul Näcke

فرۆید لە ساڵی ١٩٢٠ لە یەکێک لە پەراوێزەکانی کتێبی «سێ تێز دەربارەی سێکسوالیتە»دا ئەم دۆزینەوەیە دەداتەپاڵ Ellis Havelock و ئەویش لە ساڵی ١٩٢٧ خۆی و ناک بە دۆزەرەوەی هاوبەشی زاراوەکە دادەنێت(پوختکردنەوەی پەراوێز: و. ک).

9. Perversion

سەرەنجام چاودێرانی دەروونشیکار، سەرنجیان خستە سەر ئەو بابەتەی کە تایبەتمەندیی جودای حاڵەتی نەخۆشە خودئەڤینەکان لە زۆرێک لەو کەسانەشدا هەر دەبینرێت کە بەدەست نەخۆشیی ترەوە دەناڵێنن(بۆنمونە، سادگەر[10] لە هۆمۆسێکسواڵەکاندا ئاماژەی بۆ کردووە) و سەرەنجام ئەم بابەتە شیاو و شیمانەکراو دەردەکەوێت کە ڕەنگە لیبیدۆ بە بڕێکی چەندقات لەوە زیاتر کە وێنادەکرا دەستی لەم نەخۆشییەدا هەبێت(بەجۆرێک کە بتوانرێت پێی‌بگوترێت خودئەڤینی) و هەروەها ئەوەشی کە لیبیدۆ دەتوانێت کاریگەری بخاتە سەر گەشەی باوی سێکسیی مرۆڤ. گرفتەکانی دەروونشیکاران لە چارەسەرکردنی نەخۆشەکانی عوسابدا سەریکێشا بۆ ئەم گریمانەیە، چونکە وادەردەکەوێت سنورداریێتیی کاریگەریی نەخۆشانی ناوبراو، بۆنمونە لەم جۆرە دیدەوە سەرچاوەدەگرێت کە لەسەر خودئەڤینی بنیاتنراوە. خودئەڤینی بەم مانایە چیدی بە لادان دانانرێت، بەڵکو تەواوکەرێکی لیبیدۆیی‌یە لە ئیگۆییزمی غەریزەی خۆپاراستن[11]دا کە هەر بوونەوەرێکی زیندوو بەشبەحاڵی خۆی هەیەتی.

هاندەر [و هۆکاری]ی تۆکمەی پشت ئاوڕدانەوە لە پێکهاتنە سەرەتایی و باوەکەی خودئەڤینی، ئەودەم درووستبوو کە کرەپێلین[12] هەوڵیدا ئەوەی لەبارەی "خڵەفانی پێشوەختە[13]"ەوە

---

10. Sadger

١١. لە زیمندا مەبەست لە غەریزەی مانەوە و ڕەهەندەکانی دەوری ئەم چەمکەیە- و

12. Kraepelin

١٣. dementia praecox, کە "شێتیی گەنجێتی"یشی پێ‌دەوترێت, و دواتر کە لەڕووی چەمکایەتییەوە گەشەدەسێنێت ئیتر دەبێت بە «شیزۆفرینیا»

دەیزانین بخەینە ژێر خانەی ئەو گریمانەیەوە کە پەیوەستە بە تیۆری لیبیدۆوە، یان بلۆیلەر[14]هەوڵیدا شیزۆفرینیا بکاتە بەشێک لەو تیۆرە. ئەم جۆرە نەخۆشانە(کە من بەهۆی زاراوەی پارافرینیا(paraphrenics)[15]ـەوە دەستنیشانیدەکەم)، دوو تایبەتمەندیی سەرەکییان هەیە: خۆبەزلزانی[16] و بێمەیلی بە ڕووی دونیای دەرەوەی خۆیاندا(یان بە دەربڕینێکی تر، بێمەیلی دەرهەق بە مرۆڤەکان و شتەکان). بەهۆی ئەم بێمەیلییەشەوە، نەخۆشانی ناوبراو ناکەونە ژێر کاریگەریی دەروونشیکارییەوە و ڕەنجی ئێمە بۆ چارەسەرکردنیان ڕەنجێکی بێبەرە. هەڵبەت پێویستدەکات تێروتەسەلتر بێمەیلیی کەسانی تووشبووی «پارافرینیا» دەرهەق بە دونیای دەرەوە باسبکەین. ئەو نەخۆشانەی وا تووشی هیستریا یان عوسابی وەسواسی[17] هاتوون-و مادام

---

لەمرۆدا و وادادەنرا مێشک لە گەنجییدا دەپووکێتەوە و کەسایەتی تووشی داوەشان دەکات- و

14. Bleuler

١٥. دەتوانین بڵێین فرۆید بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە لە شیزۆفرینیا بە وردتر دەزانێت بۆ باسەکەی خۆی. زاراوەکە لەلایەن پزیشکە دەروونییەکانی سەدەی نۆزدەوە داهێنراوە و لە هەردوو بەشی پارا(ئەودیو) و فرینیا(زەین و دەروون) پێکهاتووە و ئاماژە بووە بۆ تێپەڕین لە زەینی ئاسایی و جۆرێک لە شێتی. بۆیە نەخۆشییەکە جۆرێک تێکچوونی زەینی و دەروونییە کە لە شیزۆفرینیا دەچێت و لە دوادواییەکانی تەمەندا یەخەی مرۆڤ دەگرێت. گەرچی لە شیزۆفرینیا دەچێت و توشبووەکان هەست بە بیری نامۆ و وڕێنە و خورافاتی جۆراوجۆر دەکەن، بەڵام کەسایەتی و باری دەروونیی کەسەکان بەتەواوی تێکناچێت- و

16. Megalomania

١٧. obsessional neurosis، ساڵی ١٨٩٤ لەلایەن فرۆیدەوە بەکارهێنرا و کەسەکە تووشی پشێوییەک دێکە بەبێ ویستی خۆی و بەشێوەی ناچاری کۆمەڵێم کردە و سرووست دووبارەدەکاتەوە(وەک ئەوەی زۆر بە کەشوقنگی شتندا دەچێت و ڕاڕایە، یان بەردەوام خەریکی شۆرینە). دەشێت نیشانە و سەمپتۆمەکانی بەشێوەی نەستەکییش کاربکەن و

نەخۆشییەکەیان بەردەوامە- ئیدی پەیوەندیی خۆیان بە واقیعەوە دەپسێنن. بەڵام شیکردنەوەی دەروونی دەریدەخات ئەم نەخۆشانە بە هیچ شێوەیەک پەیوەندییە ئیرۆتیکییەکانی خۆیان بە مرۆڤەکان و شتەکانیشەوە نەپچڕاندووە. ئەم پەیوەندییەیان لە خەیاڵی خۆیاندا هەر پاراستووە. بە دەربڕینێکی تر، لەلایەکەوە کۆمەڵێک ئۆبێکتی فەنتازییان لە بیرەوەریی خۆیاندا خستووەتە جێی ئۆبێکتە واقیعییەکان یاخود ئەم دوو جۆر ئۆبێکتەیان لەگەڵ یەکتردا تێکەڵکردووە؛ و لەلایەکی تریشەوە چالاکییە [واقیعییە] داینەمۆئاساکانیان خستووەتەلاوە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان کە بریتییە لەو ئۆبێکتانە. بەکارهێنانی زاراوەی ناخنشینی[18]، کە یۆنگ زۆر هەڕەمەکییانە بەکاریدەهێنێت، تەنیا دەرهەق بەم دۆخە لیبیدۆییە ڕاستدەردەچێت. دۆخی نەخۆشەکانی سەر بە «پارافرینیا» جیایە. ئەم نەخۆشانە هەر بەڕاستی لیبیدۆکەی خۆیان لە مرۆڤ و شتەکانی دونیای دەرەوە دابڕیوە، بەڵام هیچ مرۆڤ و شتێکی تریان لە خەیاڵی خۆیاندا نەکردووە بە جێگرەوەیان. ئەو کاتەی ئەو نەخۆشانە دەستدەدەنە جێگۆڕکێیەکی لەم جۆرە، ئیدی پرۆسەی ئەنجامدانی ئەم کارە وەک جۆرێک لە پرۆسەی دووەم و بەشێک لە هەوڵی ئەوان دەردەکەوێت بۆ چاکبوونەوە کە ئامانج لێی بریتییە لە گەڕاندنەوەی لیبیدۆ بۆ ئۆبێکتی ئارەزوویان.

ئێستا ئیدی کاتێتی، وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە: لیبیدۆ

---

کەسێک دایم بەرەو یەک چارەنووسی دووبارە مل بنێت و خۆیشی نەزانێت بۆ؟- و

18. introversion

چیی بەسەر دێت کاتێک کە لە شیزۆفرینیا[19]دا لە ئۆبێکتە دەرەکییەکان دادەبڕێت؟ سیفەتی خۆبەزلزانی لەم حاڵەتە [دەروونییانەدا] بەرەو لای وەڵام دەستماندەگرێت. بێگومان ئەم خۆبەزلزانییە، لەبەرامبەر ئەو لیبیدۆیەدا هاتۆتەبوون کە خۆی لەسەر ئۆبێکتی ئارەزوو چڕکردووەتەوە [واتە بەرامبەر بە لیبیدۆ-ئۆبێکت object-libido]. ئەو لیبیدۆیەی لە دونیای دەرەوە دابڕاوە، بە ئاراستەی ئیگۆدا هەڵگەڕاوەتەوە و بەم جۆرە دید و حاڵەتێک دەخولقێنێت کە دەتوانین ناوی‌بنێین **خودئەڤینی**. بەڵام خۆبەزلزانی خۆی‌لەخۆیدا دیاردەیەکی نوێ نیە، بەپێچەوانەوە، هەروەک دەشیزانین، خۆبەزلزانی دەرکەوتەی توندتری ئەو دۆخەیە کە پێشتریش هەر هەبووە. ئەمە دەبێتەهۆی ئەوەی کە خودئەڤینیی سەرچاوەگرتووی ڕووەو **خاڵیبوونەوەی دەروونی لە ئۆبێکتدا**[20] بە جۆرێک لە خودئەڤینیی دووەم بزانین کە دەخرێتەسەر خودئەڤینیی یەکەم(کە لەبەر کۆمەڵێک هۆکاری جیاواز کەوتووەتە ژێر کاریگەرییەوە).

حەزدەکەم جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە لێرەدا نیەتی ڕوونکردنەوە یان ڕۆچوونی زیاترم نیە بە باسی شیزۆفرینیادا، بەڵکو تەنیا ئەو شتانە کۆدەکەمەوە کە پێشتر لە نوسینەکانی تریشدا خراونەتەڕوو، تا هۆیەکی ماقووڵم بەدەستەوە بێت بۆ تەرحکردنی چەمکی خودئەڤینی.

ئەم کێشهێنانەوەیەی تیۆری لیبیدۆ-کە بە بۆچوونی من درووستە-بە پشتبەستن بە هۆکاری سێیەم دەتوانین پشتڕاستیکەینەوە و ئەویش بریتییە لە تێبینی و تێڕوانینەکانمان

19. schizophrenia

20. object-cathexes

دەربارەی ژیانی دەروونیی منداڵان و مرۆڤە سەرەتاییەکان (بەدەوییەکان). لەناو خەڵکە سەرەتاییەکەدا، کۆمەڵێک سیفەت بەدیدەکەین کە گەر بهاتایە و بە جیا هەبوونایە، ئەوا دەکرا بیانخەینە ڕیزی سیفەتەکانی خۆبەزلزانییەوە: زیادەڕەویکردن لە دەسەڵاتی خواست و کردەوە زەینی و دەروونییەکانیاندا، هەمەتوانایی بیرکردنەوە[21]، بڕوابوون بە هێزی ئەفسووناویی وشەکان، تەکنیکێک بۆ مامەڵەکردن و دەرەقەتهاتنی دونیای دەرەوە (دونیای جادوویی) کە وادەردەکەوێت پیادەکردنی *لۆژیکییانەی* ئەم گریمانە *زل و سەرابییانە* بێت. [بە مانایەکی تر، لەناو خەڵکە سەرەتاییەدا خودنەڤینی بەجۆرێکە کە نازانن دونیای دەرەوە بەو جۆرە بوونی هەیە و پێیانوایە وەک منداڵێک دونیا هێشتا درێژکراوەی ئەوانە].

لە منداڵانی ئەم سەردەمەدا، کە گەشەکردنیان بە لای ئێمەوە زۆر تەمومژاویترە، چاوەڕێین دیدێکی تەواو چوونیەک دەرهەق بە دونیای دەرەوە وەربگرین. بۆیە دەگەین بەو ئەنجامەی کە ئیگۆ کۆمەڵێک خەرج و خاڵیبوونەوەی سەرەتایی لیبیدۆیی ئەنجامدەدات کە سەرەنجام بڕێکی پەیوەستە بە ئۆبێکتەکانی ئارەزووەوە، بەڵام بەشە سەرەکییەکەی هەر بەردەوامدەبێت و پەیوەستە بە خاڵیبوونەوەی دەروونی لە ئۆبێکتەکانی ئارەزوودا؛ ڕێک بەو جۆرەی کە لەشی ئەمیبیا پەیوەستە بەو گەندەپێ یان پاوپێ ساختانەوە[22] کە لێیەوە دەردەچێت. لە لێکۆڵینەوەکانماندا، لەوێدا کە نیشانەکانی عوساب دەسپێکی کارەکەمان بوو، ئەم بەشە لە تەوزیعکردنی لیبیدۆ هەر لەسەرەتاوە بەناچاری خۆی

21. omnipotence of thoughts

22. Pseudopodia

لێ شاردبووینەوە. ئێمە تەنیا سەرنجمان خستبووە سەر هەڵقولانی ئەم لیبیدۆیە، واتە ئەو خاڵیبوونەوە دەروونییەی ئۆبێکتەکانی ئارەزوو کە دەکرێت بنێردرێتە دەرەوە [ی ئیگۆ] یاخود بگەڕێنرێتەوە [بۆی]. هەروەها دەتوانین بەشێوەیەکی گشتییش بڵێین، بەرامبەرکێیەک[٢٣] لەنێوان **لیبیدۆ-ئیگۆ** و لیبیدۆ- ئۆبێکت[٢٤]دا هەیە. [واتە دژیەکییەک لەنێوان ئەو لیبیدۆیەدا هەیە کە تەرکیزی لەسەر ئیگۆیە و ئەو لیبیدۆیەش کە تەرکیزی بۆ سەر ئۆبێکتی ئارەزووە لە دەرەوەی ئیگۆوە]: زۆربوونی هەرکامیان، بە کەمبوونەوەی ئەویتریان کۆتاییدێت. بالاترین پاژ و قۆناغ کە لیبیدۆ-ئۆبێکت دەتوانێت لە گەشەی خۆیدا پێیبگات بریتییە لە عاشقبوون، واتە لەو حاڵەتەدا کە وادەردەکەوێت تاکەکەس دەستی لە کەسێتیی خۆی هەڵگرتووە لەپێناوی ئەوەی خاڵیبوونەوەی دەروونیی دەرهەق بە ئۆبێکتەکانی ئارەزوو ئەزموونبکات. دۆخی پێچەوانەی ئەمەمان لە فەنتازیای نەخۆشانی پارانۆیادا هەیە(یان خۆ-درککردن) دەربارەی ئاخر زەمان[٢٥] و کۆتاییهاتنی دونیا. سەرەنجام، سەبارەت بە جیاکردنەوەی وزە دەروونییەکان لەیەکتر، گەیشتووین بەو ئاکامەی کە لە هەنگاوی یەکەمدا-واتە لە دۆخی خودئەڤینیدا- ئەم وزانە پێکەوە هەڵدەکەن و شیکردنەوەکەی ئێمەش لەوە کرچوکاڵترە بتوانین لێکیان جیاکەینەوە. هەتاکو کەسەکە خاڵیبوونەوەی

---

23. Antithesis

٢٤. دیارە هەر مەبەست لە لیبیدۆ-ئۆبێکتی ئارەزووە بەلام لەبەر ئاسانکردنەوە بەپێی توانا هەر لیبیدۆ-ئۆبێکت بەکاردەهێنین- و

٢٥. بیری ئاخر زەمان, دوو میکانیزمی هەیە: لە یەکیاندا, هەموو خاڵیبوونەوە لیبیدۆییەکە دەگوازرێتەوە بۆ سەر ئۆبێکت-عەشق(مەعشوق), لە حاڵەتەکەی تریشیاندا هەموو خەرج و خاڵیبوونەوەکە دەگەڕێتەوە بۆ ناو ئیگۆ(فرۆید).

ئۆبێکتی ئارەزوو ئەنجامنەدات، ناکرێت جیاکاری بخەینە نێوان وزەی سێکسی(لیبیدۆ) و وزەی غەریزەکانی ئیگۆوە.

بەر لە هەر جۆرە باسێکی زیاتر لەم بوارەدا، پێویستە دوو پرس تەرحبکەم کە بەرەو کرۆکی بابەتەکەمان دەبات. یەکەمیان، لەنێوان ئەم خودئەڤینییەی وا ئێستاکە باسیدەکەین و خود-ئیرۆتیزم[٢٦](کە وەک دۆخی سەرەتایی لیبیدۆ سەیریدەکەین)، چ پەیوەندییەک هەیە؟ دووەمیشیان، گەر ئەوەمان قبوڵ بێت جۆرێک لە خاڵیبوونەوەی سەرەتایی لیبیدۆ لە ئیگۆدا ڕوودەدات، ئیدی چ زەرووڕەتێکی هەیە جیاکاری بخەینە نێوان لیبیدۆی سێکسی و وزەی ناسێکسیی غەریزەکانی ئیگۆوە؟ گەر وایدابنێین یەک جۆر وزەی دەروونی هەیە، ئەوا ئەوکات لە کۆی ئەو گرفتانە ڕزگارنابین وا پەیوەستن بە جیاکردنەوەی وزەی غەریزەکانی ئیگۆ و جیاکردنەوەی **لیبیدۆی ئیگۆ** و لیبیدۆی ئۆبێکتەوە؟

سەبارەت بە پرسیاری یەکەم، دەتوانین ئاماژە بەو خاڵە بکەین کە بەناچار دەبێت گریمانەی ئەوە بکەین ناکرێت یەکێتییەکی هاوشێوەی [یەکێتیی] ئیگۆ هەر لەسەرەتاوە لە کەسەکەدا هەبێت؛ بە دەربڕینێکی تر، دەبوو ئیگۆ گەشەبکات. بەڵام غەریزەکانی خودئیرۆتیزم هەر لەسەرەتاوە هەن. لەبەر ئەمەش، پێویستدەکات شتێک بۆ سەر خودئیرۆتیکیی سێکسی زیادبکرێت(کردەیەکی دەروونیی نوێ) بۆ ئەوەی خودئەڤینی بێتەئاراوە.

داوا لە هەر دەروونشیکارێک بکرێت وەڵامی پرسیاری دووەم بداتەوە ئەوا ئاماژەکانی گومان و دوودڵیی تیا

---

[٢٦]. auto-erotic

زەقتردەبێتەوە. دەسهەڵگرتن لە تێبینی و ڕووکردنە باسوخواسی تیۆریی بێبەرهەم، بیرۆکەیەکی دڵخۆشکەر نیە؛ لەگەڵ ئەمەشدا نابێت لە هەوڵوتەقەلا بکەوین بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتەکە. خۆ ڕاستیشە کە هەندێک چەمکی وەک **لیبیدۆ-ئیگۆ**، غەریزەکانی ئیگۆ بەتایبەتی چەمکانێک نین هەروا ئاسان درکبکرێن، و ناوەڕۆکێکی دەوڵەمەندیشیان نیە. هەر جۆرە تیۆرێکی تەئەمولی و گریمانکاری[27] دەربارەی ئەو پەیوەندییانەی باسمانکرد، سەرەتا بەدوای چەمکێکی تەواو ورددا دەگەڕێت تا بیکاتە کۆڵەکەی ڕاگرتنی خۆی. بەڵام من باوەڕم وایە جیاوازیی نێوان تیۆری گریمانکاری و ئەو مەعریفەیەشی کە لەسەر تەفسیری ئەزموونی و ئیمپریکی بەندە، ڕێک هەر ئەمەیە. سودمەندبوونی گریمانکارێتی لە کۆڵەکەی بێناکۆکی و بەلۆژیک حاشاهەڵنەگر، مایەی ئیرەیی ئەو زانستە نیە کە لەسەر تەفسیری ئەزموونی بەندە، بەڵکو زانستێکی لەم جۆرە بەخۆشنودییەوە بە کۆمەڵێک چەمکی بنەڕەتیی لێڵ و وێنانەکراو شتەکە دەبڕێتەوە، کۆمەڵێک چەمک کە هیواداره لە قۆناغەکانی دواتری گەشەکردنی خۆیدا باشتر تێیانبگات یان تەنانەت چەمکانێکی تریش بخاتە جێیان. ئەمە بەو هۆیەوەیە کە ئەم ئایدیایانە کۆڵەکەی زانست نین تا هەموو شتێکیان لەسەر بنیاتبنرێت: کۆڵەکەکە تەنیا بریتییە لە تێبینیکردن[28]. بە مانایەک لە ماناکان، بنکی کۆی ئەم بونیادە نین، بەڵکو ترۆپکەکەی‌ن و جێگۆڕکێ و لابردنیشیان هیچ زیانێک بە بونیادەکە ناگەیەنێت. هەر ئەم ڕووداوە خۆی لە سەردەمی ئێمەدا خەریکە لە زانستی

27. Speculative

28. Observation

فیزیادا ڕوودەدات، چونکە چەمکە بنەڕەتییەکانی ئەم زانستە دەربارەی مادە، چەقە هێز، هێزی ڕاکێشان و هتد، هێندەی چەمکە هاوتاکانی لەنێو دەروونشیکاری‌دا جێی مشتومڕە.

چەمکەکانی «**لیبیدۆ-ئیگۆ**» و «لیبیدۆ-ئۆبێکت» لەو ڕووەوە سودبەخشن کە ئەم دوو چەمکە لە لێکۆڵینەوەی سیفەتە وردەکانی پرۆسەکانی عوساب و دەروونپەشێوییەوە هەڵێنجێنراون. دابەشبوونی لیبیدۆ بەسەر دوو جۆردا(یەکیان جۆرێکە کە بۆ ئیگۆ شیاوە و ئەویتریشیان جۆرێکە پەیوەستە بە ئۆبێکتی ئارەزووەوە)، پاشهاتی حەتمیی ئەو گریمانە سەرەتاییەیە کە غەریزە سێکسییەکان و غەریزەکانی ئیگۆ لێکجیادەکاتەوە. هەر چۆنێک بێت، تەنیا **عوسابی گواستنەوە**[29] (هیستریا و عوسابی وەسواسی) ناچاریکردم ئەم جیاکارییە بکەم، و تا ئەو جێیەشی من ئاگادارم، هەوڵی ئەو هەمووە دەروونشیکارە شکستیهێناوە کە ویستوویانە ئەم دیاردانە لە ڕێگەی ترەوە لێکبدەنەوە. لە غیابی تەواوەتیی هەر جۆرە تیۆرێکدا دەربارەی غەریزەکان کە لەم ڕووەوە یارمەتیمانبدات، ڕەنگە مافی ئەوەمان هەبێت-یان دەقیقتر بڵێین ناچارین- سەرەتا گریمانەیەک بگەیەنینە دەرەنجامە لۆژیکییەکەی تاکو یان پووچەڵ ببێتەوە یاخود بسەلمێت. ئەم گریمانەیە کە غەریزە سێکسییەکان لە سەرەتای درووستبوونەوە لە غەریزەکانی تر جیاوازن(غەریزەکانی ئیگۆ)، لەبەر کۆمەڵێک هۆی جیاجیا گریمانەیەکی درووستە، سەرباری ئەوەی گریمانەیەکی وەها بۆ شیکردنەوەی عوسابە وەسواسییەکان دەشێت بەکەڵک بێت. قبوڵمە ئەم سەرنجەی کۆتایی لە تەمومژ بەدەر نیە،

29. transference neuroses

چونکە ڕەنگە وزەیەکی دەروونیی بێباک تەنیا لەڕێگەی ڕۆیشتنەوە بەرەو ئۆبێکتێکی ئارەزوو وەرگەڕێت بۆ لیبیدۆ. بەڵام یەکەم جیاکاری کە دەخرێتە نێو ئەم تێگەیەوە هاوتایە بەو جیاکارییەی کە خەڵک تێکڕا دەیخەنە نێوان برسێتی و عەشقەوە. دووەم، ئەم جیاکارییە لەبەر کۆمەڵێک سەرنجی بایۆلۆژی شتێکی درووستە. ڕاستییەکەی هەر تاکێک دوو جۆر ژیانی هەیە: یەکیان ژیانێک کە تەنیا مەرامەکانی وی بەدیدەهێنێت و ئەویتریشیان ژیانێک کە وەک هەڵقەیەکی «نێوانگر»ی ناو زنجیرەیەک وایە. ئەم جۆرە ژیانەی دووەم جیا لە ئارەزووی تاکەکە -یان لانیکەم بەشێوەیەکی بێمەبەست- دەگوزەرێنرێت. تاک خۆی سێکسوالیتە بە مەرامی خۆی دەزانێت، لەکاتێکدا لە ڕوانگەیەکی ترەوە ئەو تاکە پاشکۆی جێرم-پلازما(germplasm)ـەکەی خۆیەتی و کۆی وزەکانیشی لە پاداشتی سودمەندبوون لە چێژ، دەخاتە خزمەتەوە. ئەو هەڵگری فانی و مرۆکی جەوهەرێکی (بەئیحتیمال) نەمر و نامرۆکە[30]؛ هەروەکو میراتگری موڵکێکی وەقفکراو کە تەنیا ساحێبی موڵکێکە و پاش مردنی ئەویش هەر دەمێنێت. جیاکردنەوەی غەریزە سێکسییەکان لە غەریزەکانی ئیگۆ، تەنیا گوزارشتە لەم جووت کارکردەی تاکەکەس. سێیەمیشیان، دەبێت ئەوەمان لەبیربێت کە ڕۆژێک دێت هەموو ئایدیا کاتییەکانمان لەمەڕ دەروونناسی لەسەر کۆڵەکە و ژێرخانێکی ئۆرگانی دادەمەزرێن. بەم جۆرە ڕێی تێدەچێت سێکسوالیتە و چالاکییە سێکسییەکان لە مادەی تایبەت و پرۆسەی کیمیاییەوە سەرچاوەبگرن و ئەم مادە و پرۆسانەش ژیانی تاک بەرەو لای ژیانی توخمی مرۆڤ

30 mortal vehicle of a (possibly) immortal substance

ڕاکێشن. ئێمە ئەم شیان و شیمانەیە بەو جۆرە وەردەگرین کە وزە دەروونییە تایبەتەکان دەخەینە جێی مادە کیمیاییە تایبەتەکان.

من هەموو هەوڵی خۆم دەخەمە گەڕ دەروونناسی لە هەر کایەیەکی تر پاککەمەوە کە ماهیەتێکی جیای لەگەڵدا هەبێت-تەنانەت تەرزی بیرکردنەوەی بایۆلۆژییانەش. ڕێک لەبەر ئەم هۆیە، حەزدەکەم لێرەدا بەڕاشکاوی دان بەوەدا بنێم کە گریمانەی لێکجیایی غەریزەکانی ئیگۆ و غەریزە سێکسییەکان(یان بە دەربڕینێکی تر *تیۆری لیبیدۆ*)، بنەمایەکی ئەوتۆی دەروونناسییانەی نیە بەڵکو بایۆلۆژیا بەتایبەت ئەمە پشتڕاستدەکاتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، هەرکات لێکۆڵینەوە دەروونشیکارییەکان خۆیان گەیشتن بە گریمانەیەکی بەکەڵکتر و دیکە دەربارەی غەریزەکان، ئەوا من [ڕێسای گشتیی تیۆرەکەم] هەڵناوەشێنمەوە و ئەم گریمانەیە ڕەتدەکەمەوە.

دیارە تا ئێستا شتی وا ڕووینەداوە. ڕەنگە دەریشکەوێت وزەی سێکسی(یان با بڵێین لیبیدۆ)، لە دیدێکی تەواو گشتی و لە ئاستێکی زۆر بنچینەییدا، تەنیا بەرهەمی جیاکارییە لە وزەی چالاک و بەگەڕکەوتووی دەروونْدا. بەڵام ئەم جەخت و پێداگرییە شتێکی نابەجێیە. چونکە پەیوەندیی بە کۆمەڵێک بابەتەوە هەیە کە بەهۆی نزیکنەبوون لە تێبینیکردنەکانمان و کەمیی زانیارییمانەوە، مشتومڕ لەسەرکردنیان هێندەی پشتڕاستکردنەوەیان بێسوودە. ڕەنگە ئەم شوناسە سەرەتاییە پەیوەندیی بە خولیا شیکارییەکانی ئێمەوە نەبێت، هەر هێندەی بێڕەبتیی خزمایەتی و نزیکایەتیی

هەموو نەژادی مرۆڤ بۆ سەلماندنی مافی میراتی کەسێکی تایبەت. ئەم تیۆریزەکردنانە سەرلەبەر بێسوودن. مادام ناتوانرێت چاوەڕێ بکرێت زانستێکی تر فریای ئەنجامە مسۆگەرەکانی تایبەت بە تیۆری غەریزەکان بکەوێت، ئەوا باشترە چەندقات هەوڵبدەین ئەوە ئاشکرابکەین کە تێهەڵکێشبوونی دیاردە دەروونییەکان چۆنچۆنی یارمەتیی حەلکردنی ئەم کێشە بنەڕەتییەی بایۆلۆژیا دەدات. باشتر وایە ئەگەری بەهەڵەداچوون قبوڵکەین، بەڵام نابێت لە تاوتوێکردنی دەلالەتەکانی ئەو گریمانەیە پاشگەزبینەوە کە سەرەتا هەڵمانبژارد-یان لەڕاستیدا گریمانەیەک کە لە شیکردنەوەی عوسابە نەگوازراوەکانەوە بەدەستهات-، (واتە ئەو گریمانەیەی کە دژایەتییەک لەنێوان غەریزەکانی ئیگۆ و غەریزە سێکسییەکاندا هەیە). هەروەها نابێت لە تاوتوێکردنی ئەم بابەتەش پەشیمانبینەوە کە ئاخۆ ئەم گریمانەیە خاڵییە لە ناکۆکی(دژگۆیی) و شتێکی بەپیتە؟ و ئاخۆ دەشتوانین دەرهەق بە نەخۆشییەکانی تر بەکاریبهێنین یان نا(نەخۆشیگەلی وەک شیزۆفرینیا).

دیارە گەر بسەلمێت تیۆری لیبیدۆ لە هەوڵەکەیدا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم نەخۆشییەی کۆتایی نوشوستیهێناوە، ئەوا ئەودەم مەسەلەکە گۆڕانی بەسەردا دێت. یۆنگ(١٩١٢) بە پێداگرییەوە ئەم بانگەشەیەی خستووەتەڕوو و هەر لەبەر ئەمەشە وێڕای مەیلی خۆم، هاتوومەتە نێو ئەم باسوخواسەی کۆتاییەوە. من وەک شەخس ئارەزووم لێ بوو تا کۆتایی درێژە بەو ڕێگایە بدەم کە لە شیکردنەوەی نەخۆشییەکەی شرێبەر[٣١]ەوە دەستمپێکرد و هەرگیزیش

٣١. شرێبەر (Daniel Paul *Schreber*)، ناوی دادوەرێکی ئەڵمانیی سەر

ئاورِم لە باسکردنی گریمانکراوەکانی نەدایەوە. بەڵام بانگەشەکەی یۆنگ، لانیکەم، هەڵەشانە و پێنەگەیشتووە. ئەو هۆیانە بۆ سەلماندنی بانگەشەکەی دەیخاتەڕوو، بەس نین. یەکەم، یۆنگ پەنا بۆ ئەو بابەتە دەبات کە من خۆم قبوڵمکردووە لەبەر سەختییەکانی شیکردنەوەکەی شرێبەر پەرە بە چەمکی لیبیدۆ بدەم(بە دەربڕینێکی تر، واز لە ناوەڕۆکە سێکسییەکەی بێنم) و لیبیدۆ تێکڕا لەگەڵ خولیای دەروونی(psychical interest)دا بە یەکێک دانێم.

فرینچزی(١٩١٣)[٣٢]، لە ڕەخنەیەکی گشتگیردا دەرهەق بە وتارەکەی یۆنگ، هەموو ئەو شتانەی خستووەتەڕوو کە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم تەفسیرە نادرووستە پێویستە. من هەر ئەوەندەم لەدەستدێت ڕەخنەکەی فرینچزی پشتڕاستکەمەوە و ئەوە دووپاتکەمەوە کە [بەپێچەوانەی

بە دادگای تێهەڵچوونەوە بوو کە فرۆید لەساڵی ١٩١١ کتێبێکی لەبارەوە نوسی بەناوی دۆسیەیەکی پارانۆیا. شرێبەری داوەر، سێ جار تووشی دەروونپەشێوی هاتبوو. پاش یەکەمیان، کتێبێکی نوسی بەناوی «بیرەوەرییەکانی نەخۆشییە دەمارییەکەم». فرۆید قەت ئەم دادوەرەی نەبینی، و تەنیا بەهۆی شیکردنەوەی کتێبەکەیەوە هەندێک حوکمی دەروونشیکارانەی لەسەر وی دا. لە سەروبەندی کتێبەکەی فرۆیدیشدا دەبێت کە کۆچیدواییدەکات. فرۆید لە ئەنجامی خوێندنەوەی کتێبەکەی شرێبەرەوە دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە ڕقی شرێبەر لەوانیتر، و هەستکردنی بەوەی بووەتە ژن، و قسەشی لەگەڵ خوادا کردووە ئەوەیە: شرێبەر هاوڕەگەزبازییەکی چەپێنراوی هەبووە و ئەمەش وایکردووە عاشقی کۆمەڵێک پیاو ببێت و لێرەشەوە هەستێکی خراپی وەرگرتووە بۆیە لەڕێگەی میکانیزمی بەرگریی ئاوەژووکردنەوەوە وتوویەتی: من ڕقم لەو پیاوانەیە. هەر لەدرێژەدا، بەهۆی میکانیزمی دەرهاوێژییەوە، لەجیاتیی ئەوەی بڵێت من ڕقم لەوانە کەچی وتوویەتی «ئەوان ڕقیان لە منە». فرۆید پێیوایە شرێبەر تووشی وڕێنە و پارانۆیا هاتووە و ڕیشەکەشی هاوڕەگەزبازییەکی منداڵییە کە لە باوکیەوە وەرگەڕاوە بۆ ئەو پیاوانەی تر کە ڕەمزی باوکێتی و هێز بوون-و

32. Ferenczi

تۆمەتەکەی یۆنگەوە] هەرگیز وازم لە ڕوانگەکەی خۆم نەهێناوە لەمەڕ تیۆری لیبیدۆ. ئەرگۆمێنتێکی تری یۆنگ (واتە گەڕاندنەوەی لیبیدۆ بۆ ناو [ئیگۆ] «کە خۆی لەخۆیدا نابێتەهۆی تێکچوونی کارکردی واقیع»)، لەڕاستییدا لێدوانە نەک ئەرگۆمێنتێک[ـی سەلمێنراو]. یۆنگ، بابەتەکە بە شتێکی بنجبڕ و گردەبڕ ناوزەددەکات و هێنانەوەی ئەرگۆمێنت و بەڵگە بە شتێکی پێویست نازانێت. ئەوەی ئاخۆ بابەتێکی وەها مومکینە یان چۆنچۆنی دەتوانێت مومکین بێت، ڕێک ئەو خاڵەیە کە دەبوو [لە وتارەکەی یۆنگدا] تاوتوێبکرایە. یۆنگ لە نوسینە سەرەکییەکەی دواتریدا(١٩١٣)، ڕێک لەو ڕێگەچارەیە غافڵدەبێت کە دەمێک لەوەو پێش ئاماژەم بۆ کردبوو. ئەو دەنوسێت: «لە هەمان کاتدا، دەبێت ئەم خاڵەشمان لەبەرچاو بێت(خاڵێک کە فرۆید بە شێوەیەکی زیمنی لە کتێبەکەیدا دەربارەی شێوازی چارەسەرکردنی شرێبەر ١٩١١ ئاماژەی بۆ دەکات)، کە ناخنشینیی لیبیدۆی سێکسی سەردەکێشێت بۆ خاڵیبوونەوەی دەروونیی ئیگۆ، و ئەوەشی کە هەر ئەم بابەتە بایسی لەناوچوونی [کارکرد]ی واقیعە [لە زەینی نەخۆشەکەدا]. ئیمکانی ڕوونکردنەوەی دەروونناسیی لەناوچوونی [کارکرد]ـی واقیع بەم شێوەیە، هەربەڕاستی شتێکی وەسوەسەبزوێنە». بەڵام یۆنگ زۆریش ناچێتە ناو وردەکاریی زیاتری ئەم ئیمکانەوە. چەند دێڕێک دواتر، یۆنگ بە ڕاگەیاندنی ئەوەی کە ئەم فاکتەرە یەکلاکەرەوەیە «دەبێتەهۆی دەروونناسیی زاهیدی ڕیازەتکێش، نەک دەروونناسیی *خڵەفانی پێشوەختە*»، ئیمکانی باسکراو ڕەتدەکاتەوە. ئەوەی کە ئەم بەراوردە نابەجێیە چەند کەم دەتوانێت یارمەتیی چارەکردنی ئەم کێشەیە بدات،

بە لەبەرچاوگرتنی ئەم بابەتە دەتوانین تێبگەین ڕەفتاری زاهیدێکی ئاوەها کە «هەوڵدەدات هەر جۆرە نیشانەیەکی خولیای سێکسی ڕیشەکێشبکات»(هەڵبەت سێکسی بە مانای عەوامانەی وشەکە)، بەناچاری دەرخەری هیچ جۆرە دابەشکردنێکی نەخۆشخەری لیبیدۆ نیە. ڕەنگە بەگشتی بوویێتە ڕێگر لەبەردەم ئاراستەی خولیای سێکسیی خۆیدا بەرەو مرۆڤەکان، بەڵام لە فۆرمی خولیایەکی توندەوەبوودا بۆ ئلوهیەت(خوایەتی)، یان سرووشت یان مەملەکەتی گیانەوەران بڵندبوویێتەوە[٣٢]. بەبێ ئەوەی لیبیدۆی لەڕێگەی ناخنشینییەوە ڕووبکاتە فەنتازیاکانی یان بگەڕێتەوە بۆ ئیگۆ. [واتە لیبیدۆکە خەرجبووە و خاڵیبووەتەوە بەڵام بەرەو ئۆبێکتێکی زەبەلاح و نادیار].

وادەردەکەوێت ئەم بەراوردە ئیمکانی جیاکاریی نێوان خولیا سەرچاوەگرتووەکە لە سەرچاوە ئیرۆتیکییەکە و باقیی خولیاکانی تریش پووچەڵدەکاتەوە. هەروەها ئەوەشمان لەبیر بێت کە لێکۆڵەرانی قوتابخانەی سویسرا، تەنیا دوو دیویان لە مەسەلەی *خلەفانی* پێشوەختە ڕوونکردووەتەوە(یەکیان بوونی ئەو گرێیانەی وا لەم نەخۆشییەدا کە هەم لە کەسانی تەندرووستدا بینیومانە و هەم لە کەسانی عوسابییشدا، و ئەویتریشیان لێکچوونی فەنتازیاکانی توشبووانی ئەم نەخۆشییە لەتەک ئوستورە پۆپۆلارەکاندا) کە هەڵبەت شتێکی بەنرخە، بەڵام نەیانتوانیوە میکانیزمەکانی ئەم نەخۆشییە ڕوونترکەنەوە. بۆیە دەتوانین ئەو بانگەشەیەی

---

٣٢. بڵندبوونەوە، میکانیزمێکی بەرگریی دەروونییە بەتەنیشت میکانیزمەکانی ترەوە کە شتانێکی پەسەندنەکراو بە ڕێگایەکی نائاگایانەی پەسەندکراو دێنێتەدی- و

یۆنگ ڕەتکەینەوە گوایە تیۆری لیبیدۆ نەیتوانیوە *خڵەفانی* پێشوەختە تەفسیربکات و هەر لەبەر ئەمەش بۆ تاوتوێکردنی عوسابەکانی تر بەکارنایەت.



به ده‌ستی هونه‌رمه‌ندی ئیتالی كاراڤاجیۆ، ١٥٩٩

# دوو

لەو بڕوایەدام لێکۆڵینەوەی ڕاستەوخۆ لە خودئەڤینی، کۆمەڵێک سەرێشەی تایبەت بە خۆی هەیە. سەرەکیترین ڕێگە پەیبردنمانە بە تایبەتمەندییەکانی ئەم نەخۆشییە، پێدەچێت هەر شیکردنەوەی نەخۆشەکانی سەر بە پارافرینیا بێت. ڕێک هەر بەو جۆرەی کە لەڕێگەی تاوتوێکردنی *عوسابەکانی گواستنەوەوە* توانیومانە هۆکاری ئەنگێزە و هاندەرە[٣٤] غەریزییەکانی لیبیدۆ بدۆزینەوە، بۆیە بەهۆی پشکنینی *خلەفانی* پێشوەختە و پارانۆیاوە دەگەین بە کۆمەڵێک تێڕوانین لەمەڕ دەروونناسیی ئیگۆ.

لەم حاڵەتەدا، بۆ تێگەیشتن لەوەی لە دیاردە ئاساییەکاندا زۆر سادە دێتەبەرچاو، دەبوو سود لە پانتایی پاتۆلۆژیا و تێکچوونەکان[٣٥] و زیادەڕەوییەکانی وەربگرین. هەڵبەت دەتوانین سود لە هەموو ئەو ئامرازانەی تریش وەرگرین کە

٣٤. ئەنگێزە و هاندەر و بزوێنەر و هتد, impulse, کۆمەڵێک ناون بۆ ئەو هێزە کتوپڕ و توندانە بەکاردەهێنرێن کە لە نەست و ئید-ەوە سەرچاوەدەگرن و لە کارەکانی فرۆیددا بەردەوام دووبارەدەبنەوە- و

35. Distortions

مەعریفەیەکی باشترمان دەدەنێ سەبارەت بە خودئەڤینی. ئێستاش حەزدەکەم ئەم ئامرازانە بەپێی ئەم ڕیزبەندییەی خوارەوە بخەمە بەر تاوتوێ: لێکۆڵینەوە دەربارەی نەخۆشییە ئۆرگانییەکان، خۆبەنەخۆشزانین(hypochondria)، و ژیانی ئیرۆتیکیی هەردوو ڕەگەزەکە.

لە خەملاندنی کاریگەریی نەخۆشییە ئۆرگانییەکاندا بۆ سەر دابەشکردنی لیبیدۆ، ئەو ڕوانگەیە پەیڕەودەکەم کە ساندۆر فرینچزی بە دەم پێی وتم. هەموان ئەمە دەزانن و وەک شتێکی ئاسایی تێی دەگەن کاتێک تاکەکەس تووشی ژان و ناڕەحەتی هاتووە باک و خولیای بە دەرکەوتەکانی دونیای دەرەوە نامێنێت، چونکە ئەو دەرکەوتانە پەیوەندییان بە ژان و ئازارەکەی ئەوەوە نیە. لەڕێگەی تێبینیکردنی زیاترەوە تێدەگەین نەخۆشێکی لەم جۆرە خولیای لیبیدۆیی خۆی لە ئۆبێکتی عەشقەکەی دادەبڕێت؛ بە دەربڕینێکی تر، تا ئەو کاتەی ژانوئازار درێژەی هەیە، عاشقبوون ڕادەگرێت. نابێت گردەبڕی و بەڵگەنەویستیی ئەم ڕاستییە، ببێتە ڕێگر لە پشکنینی بەپێی تیۆری لیبیدۆ. بۆیە پێویستدەکات بێژین: مرۆی نەخۆش خاڵیبوونەوە لیبیدۆییەکانی بەرەو ئیگۆی خۆی ڕاپێچدەکات و لەپاش چاکبوونەوە جارێکی تر ئەو خاڵیبوونەوە لیبیدۆییە دەرهەق بە کەسانێکی غەیری خۆی ئەنجامدەدات. ولیام بوش[٣٦]، دەربارەی ئەو نوسەر و شاعیرەی وا ددانی دێشێت، دەڵێت: «ڕۆحی بەسەر چاڵی چکۆلەی مۆلارەکەیەوە چڕبووەتەوە». ئا لێرەدا، لیبیدۆ و خولیاکانی ئیگۆ چارەنووسێکی هاوبەشیان هەیە و جارێکی تر لێک جیانابنەوە. ئیگۆییزم و خۆپەرستیی ناسراوی کەسی

36. Wilhelm Busch 1908-1832

نەخۆش، هەم لیبیدۆ دەگرێتەوە و هەم خولیاکانی ئیگۆیش. ئەم ئیگۆییزمە لە دیدی ئێمەوە شتێکی تەواو سرووشتییە، چونکە دڵنیاین خۆیشمان نەخۆش بکەوین هەر بەو جۆرە هەڵسوکەوتدەکەین. بەڵام ئەوەی کە تەپینی جەستەیی، هەستەکانی کەسی عاشق-سەرباری تین‌وتوندیی ئەو هەستانە- لەناودەبات و لەناکاو بێباکییەکی تەواو دەخاتە جێی، تێمایەکە ساتیرنوسان بەپێی پێویست ئاوڕیان لێ داوەتەوە.

خەویش لەم ڕووەوە لە نەخۆشی دەچێت وەکبڵێی کەسەکە لیبیدۆکەی خۆی بە ئاراستەی خودی خۆیدا هەڵگەڕاندۆتەوە، یان گەر دەقیقتر بڵێین، کۆی ئەو وزەیەی بەرەو تاکە خواستی خەوتن ڕاپێچکردووە. ئیگۆییزمی خەونەکان فیتاوفیت لەگەڵ ئەم سیاقەدا دێتەوە. لە هەردوو حاڵەتەکەدا، نمونەی کۆمەڵێک گۆڕانکارییمان هەیە بۆ تەوزیعکردنی لیبیدۆ کە لە گۆڕانی ئیگۆوە سەرچاوەیانگرتووە.

خۆبەنەخۆشزانین، هەروەکو نەخۆشییە ئۆرگانییەکان، خۆی لە شێوەی حاڵەت و هەستی ئازاردەری جەستەییدا دەردەخات و کاریگەرییەکەشی لەسەر دابەشکردنی لیبیدۆ، لە کاریگەریی نەخۆشییە ئۆرگانییەکان دەچێت. کەسی خۆبەنەخۆشزان، خولیا و بەتایبەتییش لیبیدۆکەی خۆی بەرەو ئۆبێکتەکانی دەرەوە هەڵدەگەڕێنێتەوە و هەردووکی بەرەو ئەو ئەندامەی جەستەی چڕدەکاتەوە کە سەرنجی ئەوی بە خۆیەوە قاڵکردووە. لەنێو ئەو شتانەی باسمانکردن، یەکێک لە جیاوازییەکانی خۆبەنەخۆشزانین لەگەڵ نەخۆشییە

ئۆرگانییەکاندا دەردەکەوێت: لە نەخۆشییە ئۆرگانییەکاندا، حاڵەت و هەستە ئازاربەخشەکان لەسەر گۆڕانکارییە سەلمێنراوەکان [ی ناو ئۆرگانەکانی لەش] بەندن، لەکاتێکدا لە خۆبەنەخۆشزانیندا شتەکە وەها نیە. بەڵام تەواو لەگەڵ تێگەیشتنە گشتییەکەماندا تەبادێتەوە کە بڵێین کەسی خۆبەنەخۆشزان ڕاستدەکات: دەشبێت حزووری گۆڕانکارییە ئۆرگانییەکان لە خۆبەنەخۆشزانیندا لەبەرچاوبگرین.

بەڵام ئاخۆ ئەم گۆڕانکارییانە چی بن؟ لێرەدا پشت بە ئەزموونی خۆمان دەبەستین، ئەزموونێک کە دەریدەخات هەستە جەستەییە ناخۆشەکان-هاوشێوەی ئەو هەستانەی کە لە خۆبەنەخۆشزانیندا لە کەسەکەدا دەردەکەون- لە باقیی توشبووەکانی عوسابیشدا ڕوودەدەن. بەر لەمەش وتوومە حەزدەکەم خۆبەنەخۆشزانین لە ڕیزی نیورەشتینیا[٣٧] (neur-asthenia) و عوسابی دڵەڕاوکێ‌دا، بە شێوازی سێیەمی عوسابی "واقیعی"ـی دابنێم. پێدەچێت زیادەڕەوی نەبێت گەر وای‌دابنێین لە باقیی عوسابەکانی تردا، خۆبەنەخۆشزانینیش هاوکات بەڕێژەیەکی کەم زۆرجار بەسەر کەسەکەدا دێت. پێموایە، باشترین نمونەی ئەم دۆخە لە عوسابی دڵەڕاوکێدا دەبینرێت کە هەڵگری سەرخانێکی هیستریاییە. نمونەی پڕاوپڕ و ئاشنای ئۆرگانێک کە هەستیارییەکی بەژانی هەیە، و بەجۆرێک گۆڕانی بەسەردا دێت و هاوکات بە مانای باوی وشەکەش نەخۆش نەبێت، بریتییە لە کۆئەندامی زاوزێ لە ساتی ڕەپبووندا. لە حاڵەتی ناوبراودا، کۆئەندامی

---

٣٧. وێڕای سیاقەکەی فرۆید، دەبێت بڵێین نیورەشتینیا عوسابێکە هاوشان بە شەکەتی و داهێزرانێکی زۆر کە سەرێشەی توندی لەگەڵە و تەرکیز کەمدەبێتەوە و کەسەکە شتێکی ئەوتۆی پێ ناکرێت- و

زاوزێ پڕدەبێت لە خوێن و هەڵدەئاوسێت و شێداردەبێت و دەبێتە چەقی ئەنواوئەشکاڵ ورووژان. ئێستا ئیدی شیاوە هەر ئەندام و ئۆرگانێکی لەش کە بمانەوێت هەڵبژێرین و چالاکییەکەی لە ناردنی بزوێنەرە سێکسییەکاندا بۆ زەین، وەک ئیرۆتیکورووژێنی[38] وەربیگرین. هەروەها بیر لەو بابەتە بکەینەوە کە هەندێک تێبینی لەڕووی سێکسییەوە تیۆرەکەمانی لەسەر بنیاتنراوە، لە مێژە بیریان وا ڕاهێناوین هەندێک ئۆرگانی تری لەشمان(ناوچە ورووژێنەرەکان) دەتوانن لەجیاتیی کۆئەندامی زاوزێ کارا بن و هەروەکو ئەوان کاربکەن. لەو حاڵەتەدا، دەبێت تەنیا یەک هەنگاوی تر بنێین: دەتوانین بڕیاربدەین ئیرۆتیکورووژێنی و شەهوانیبوون بە تایبەتمەندیی گشتیی هەموو ئۆرگانەکانمان دابنێین و لەسەر ئەم بنچینەیە قسە لەسەر زیادبوون یاخۆ کەمبوونی شەهوانیبوون لە بەشێکی تایبەتی لەشدا بکەین. بەم جۆرە، لەبەرامبەر هەر گۆڕانکارییەکی وەهادا لە ئیرۆتیکورووژێنی و شەهوانیبوونی ئەندامەکانی لەشدا، دەشێت گۆڕانێکی بەدیل لە خاڵیبوونەوەی دەروونی لە ئیگۆدا ڕوویدات. ئەم فاکتەرانە هەموو ئەو شتانە بەدیدەهێنن کە ئێمە وەک کۆڵەکەی خۆبەنەخۆشزانین سەیریاندەکەین، و هەم ئەوەشی کە دەتوانێت کاریگەرییەکی وەک نەخۆشیی جەستەیی ئۆرگانەکان لەسەر دابەشکردنی لیبیدۆ جێبهێڵێت.

ئاشکرایە گەر ئەم ئایدیا و ئەرگۆمێنتە قبوڵکەین، ئەوا نەک هەر بەر گرفتی خۆبەنەخۆشزانین دەکەوین بەڵکو بەر گرفتی عوسابە واقیعییەکانیش دەکەوین(نیورەشتینیا و عوسابی دڵەوڕاوکێ). بۆیە جێی خۆیەتی هەر لێرەدا بوەستین. سنور

38. Erotogenicity

و ڕووبەری لێکۆڵینەوەیەکی تەواو دەروونناسییانە، تا ئەم ڕادەیە ڕەوایەتی بە دەرچوون لە سنورەکانی لێکۆڵینەوەی دەروونناسییانە نادات. بە باسکردنی ئەم خاڵە دەیبرێنمەوە کە لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین ئەگەری ئەوە دانێین پەیوەندیی خۆبەنەخۆشزانین بە پارافرینیاوە، هاوشێوەی پەیوەندیی عوسابە واقیعییەکانی ترە بە هیستریا و عوسابی وەسواسییەوە. بە دەربڕینێکی تر، ڕەنگە بتوانین بڵێین پەیوەندیی ئەم دووانە بەستراوەتەوە بە ئیگۆ-لیبیدۆوە، ڕێک بەو جۆرەی کە عوسابەکانی تر ملکەچی لیبیدۆ-ئۆبێکتن. هەروەها دڵەڕاوکێی خۆبەنەخۆشزانانە هاوتای دڵەڕاوکێی عوسابییە چونکە لە لیبیدۆ-ئیگۆوە سەرچاوەدەگرێت[(دوای ئەوەش، دڵەڕاوکێی خۆبەنەخۆشزانین هاوتای دڵەڕاوکێی عوسابییانەیە چونکە لە لیبیدۆ-ئیگۆوە سەرچاوەدەگرێت)]. هەروەها مادام دەزانین میکانیزمی تووشبوونی نەخۆشی و درووستبوونی سەمپتۆمەکان لە *عوسابەکانی گواستنەوە*دا(ڕێڕەوی ناخنشینی بەرەو گەڕانەوە و پاشەکشە[39]) پەیوەستە بە بەرگرتنی لیبیدۆ-ئۆبێکتەوە، وشیارییەکی دەقیقتر دەربارەی جڵەوی لیبیدۆ-ئۆبێکت پەیدادەکەین و دەتوانین بیبەستینەوە بە هەردوو دیاردەی خۆبەنەخۆشزانین و پارافرینیاوە.

دیارە لێرەدا فزووڵی و کونجکۆڵییەکەمان سەردەکێشێت بۆ ئەو پرسیارەی کە بۆ دەبێ کۆبوونەوەی لیبیدۆ لە ئیگۆدا شتێکی ناخۆش بێت بە لای کەسەکەوە؟ بەم وەڵامە بەسدەکەم و دەیبڕێنمەوە کە ناخۆشبوونەکە هەمیشە گوزارشتە لە بڕێکی باڵاتری گرژی، بۆیە ئەوەی ڕوودەدات ئەوەیە کە چەندایەتی

39. Regression

و بڕێک[40] لە پانتایی ڕووداوە ماتریالییەکان لێرەشدا وەک جێگاکانی تر وەردەچەرخێت بۆ چۆنایەتییەکی دەروونیی ناخۆش. [وەکچۆن لە چەمک و کاتیگۆرییە فەلسەفییەکانیشدا هەرکات چەندێتی توندبووەوە سەردەکێشێت بۆ چۆنیەتی]. لەگەڵ ئەمەشدا، ڕەنگە ئەوەشی ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەی هەیە لە درووستکردنی ناخۆشیدا، بەرفراوانیی ڕەهای ڕووداوی ماتریاڵی نەبێت بەڵکو کارکردێکی تایبەتی ئەو بەرفراوانییە ڕەهایە بێت. لێرەدا دەتوانین بوێری بنوێنین و بەشێوەیەکی ڕاگوزەر ئاوڕ لەم مەسەلەیە بدەینەوە کە لەبنچینەوە چ شتێک دەبێتەهۆی ئەوەی ژیانی دەروونییمان ڕووبەری خودئەڤینی تێپەڕێنێت و لیبیدۆ بەرەو ئۆبێکتی ئارەزوو ئاراستەبکات. بەپێی ئەرگۆمێنتەکەی سەرەوە، دیسان وەڵامەکە ئەوەیە زەروورەت ئەودەم درووستدەبێت کە ئیگۆ بڕێکی هێجگار زۆر لیبیدۆی بەکارهێنابێت بۆ خاڵیبوونەوەی دەروونی. ئیگۆییزمێکی بەهێز کردەیەکە بۆ خۆپارێزی لە نەخۆشی، بەڵام وەک دواچارە هەر دەبێت عاشق بین بۆ ئەوەی لە ئاسایشدا بین؛ و گەر بەهۆی بێئەمەلبوونیشەوە نەتوانین عاشق بین، ئەوا ئەوکات مسۆگەرە عاشق دەبین. ئەم ڕوانگەیە تاڕادەیەک تەبایە لەگەڵ بەیتەکانی "هاینە"دا ئەو کاتەی وەسفی **دەروونپەیدایی ئەفراندن**[41] دەکات: «شکی تیا نیە نەخۆشی دوا هۆی پشت هەموو بزوێنەرێکی ئەفراندنە/ بەهۆی ئەفراندنەوە دەکرا چاک ببمەوە/ بەهۆی ئەفراندنەوە ساغ بوومەوە». [لەم دێڕانەدا لیبیدۆ ئاراستەی ئۆبێکتی ئارەزوو کراوە لە دەرەوەوە و ئەو ئۆبێکتەش بریتییە لە ئەفراندن و داهێنان].

40. Quantity

41. psychogenesis of the Creation

ئێمە تێگەیشتووین لەوەی کە کۆئەندامی دەروونییمان بە پلەی یەکەم بۆ ئەوە داڕێژراوە تا بەسەر ئەو وروژان و خرۆشانانەدا زاڵ ببێت کە لە حاڵەتی پەرێشان‌زەینیدا کاریگەرییەکی نەخۆشخەر و پاتۆلۆژییان هەبوو. ئاوڕدانەوە لەم خرۆشانانە لە دەروون [و زەین]دا کۆمەکێکی گەورەیە بە خاڵیبوونەوەی دەروونیی ئەو خرۆشانانەی کە یان ناتوانن ڕاستەوخۆ بەرەو دەرەوە خاڵیبکرێنەوە یان خاڵیکردنەوەیان بەم شێوازە شتێکی نەخوازراوە. بەڵام لە حاڵەتی یەکەمدا [واتە مەحاڵبوونی خاڵیکردنەوەی ناوەکیی خرۆشانەکان]، فەرقناکات ئاخۆ ئەم پرۆسە ناوەکییەی خرۆشانەکان دەرهەق بە ئۆبێکتی ئارەزوو ڕوودەدات یان دەرهەق بە ئۆبێکتە فەنتازییەکان.

ئەوە دواترە کە جیاوازیی نێوان ئەم دووانە زەقدەبێتەوە، واتە هەرکە ئاراستەکردنی لیبیدۆ بەرەو ئۆبێکتی ئارەزووە ناواقیعییەکان (ناخنشینی) ببێتەهۆی گردبوونەوەی وی. لە نەخۆشەکانی پارافرینیادا، خۆبەزلزانی بەشێوەیەکی چوونیەک ئیمکانی ئاوڕدانەوەی ناوەکی لە لیبیدۆی گەڕاوەی نێو ئیگۆ دەڕەخسێنێت. ڕەنگە تەنیا ئەو کاتەی کە خۆبەزلزانی لەم کارەدا سەرنەکەوێت، ئیدی کۆبوونەوەی لیبیدۆ وەک شتێکی پاتۆلۆژی و نەخۆشخەر دەکەوێتەوە و دەستدەکات بە پرۆسەی چاکبوونەوە، پرۆسەیەک کە بۆ ئێمە وەک جۆرێک نەخۆشی دەردەکەوێت.

لێرەدا نەختێک زیاتر میکانیزمی پارافرینیا تاوتوێدەکەین و ئاماژە بەو ڕوانگانە دەکەین کە بە بڕوای من شایستەی تاوتوێ و پشکنینن. بە بۆچوونی من، جیاوازیی ناخۆشییەکانی

پارافرینیا لەگەڵ *عوسابەکانی گواستنەوە*دا، ئەوەیە کە لە یەکەمیاندا ئەو لیبیدۆیەی وا بەهۆی بێئەمەلبوونەوە ئازادبووە رووناکاتە ئۆبێکتەکانی ئارەزوو لە فەنتازیادا، بەڵکو بەرەو ئیگۆ هەڵدەگەرێتەوە. بۆیە، خۆبەزلزانی لەگەڵ زاڵبوونی دەروونیی سەر ئەم برەی کۆتایی لیبیدۆدا رێکدەکەوێت، بۆیە هاوتای ئەو ناخنشینی و فەنتازیایەیە کە لە *عوسابەکانی گواستنەوە*دا بەدیدەکرێن. ناکامبوونی ئەم کارکردە دەروونییە دەبێتەهۆی سەرهەڵدانی خۆبەنەخۆشزانیی پارافرینی کە دۆخێکی هاوشێوەی دڵەڕاوکێیە لە *عوسابەکانی گواستنەوە*دا. دەزانین لەرێگەی کردەی دەروونیی زیاترەوە دەتوانین ئەم دڵەڕاوکێیە لاببەین، واتە لەرێگەی **گۆڕین و بەدلکردن**(conversion)[٤٢]ـەوە، بەرسڤی پێچەوانە[٤٣] یان سازدانی کەرەستەی پارێزگاری(فۆبیاکان). ئەو پرۆسە هاوتایەی کە [بۆ لابردنی دڵەڕاوکێ] لە پارافرینیادا ڕوودەدات بریتییە لە هەوڵدان بۆ گێڕانەوە، و هەروەها دەرکەوتە و مانیفێستبوونە بەرچاوەکانی نەخۆشییەکەش هەر لەمەوە سەرچاوەدەگرن. مادام پارافرینیا-گەرچی عادەتەن نا-تەنیا دەبێتەهۆی پچڕاندنی **بەشەکی و پارچەکیی** لیبیدۆ لە ئۆبێکتەکانی ئارەزوو، ئەوا دەتوانین لە وەسفە کلینیکییەکەیدا ئاماژە بۆ سێ دەستە دیاردە بکەین:

---

٤٢. گۆڕین یان بەدلکردن: دەرکەوتنی بارە دەروونییەکە لە فۆرمی جەستەییدا- و

٤٣. بەرسڤی پێچەوانە(formation reaction): میکانیزمێکی بەرگریی دەروونییە کە سوبێکت لەرێگەی وەلام و بەرسڤێکی پێچەوانەوە هەوڵی کەمکردنەوەی دڵەڕاوکێ و چەپێنراوە ناخۆشەکانی خۆی دەداتەوە. بۆنمونە، رقبوونەوە لە کەسێک لە شێوەی خەمخواردنێکی توندا بۆ ئەو کەسە دەگەرێتەوە- و

١. ئەو دیاردانەی کە گوزارشت لە دۆخێکی بەجێماوی پاش دۆخێکی نۆرماڵ دەکەن(دیاردە نیشتوو و بەجێماوەکان).

٢. ئەو دیاردانەی کە گوزارشت لە پرۆسەی ناتەندرووست دەکەن(دابڕینی لیبیدۆ لە ئۆبێکتەکانی ئارەزووی و هەروەها خۆبەزلزانی، خۆبەنەخۆشزانین، شپرزەبوونی عاتفی و جۆرەکانی گەڕانەوە و پاشەکشە).

٣. ئەو دیاردانەی کە گوزارشت لە *گەڕانەوە* دەکەن، و لیبیدۆ تیایاندا بە شێوەی هیستریا(خڵەفانی پێشوەختە یان پارافرینیا بە مانای تەواوەتیی وشەکە) یان بە شێوەی عوسابی وەسواسی(لە پارانۆیادا) جارێکی تر ڕوودەکاتەوە ئۆبێکتەکانی ئارەزوو. ئەم خاڵیبوونەوە لیبیدۆییە تەڕوتازەیە لەو ڕووەوە لە خاڵیبوونەوە سەرەتاییەکە جیایە کە لە ئاستێکی تر و دۆخێکی تردا دەکەوێتەگەڕ. لە تاوتوێکردنی جیاوازیی نێوان *عوسابەکانی گواستنەوە* کە لەم خاڵیبوونەوە لیبیدۆییە تازەوە سەرچاوەدەگرن و ئەو فۆرماسیۆنە هاوتایانەشی کە ئیگۆ تێیاندا نۆرماڵ و ئاساییە، دەتوانین بگەین بە بەنرخترین ڕوانین لەبارەی پێکهاتەی کۆئەندامی دەروونیی مرۆڤەوە.

سێیەمین ڕێگا بۆ لێکۆڵینەوە لە خودنەڤینی، بریتییە لە تێبینیکردنی ژیانی ئیرۆتیکیی مرۆڤەکان بە هەموو جۆرە جیاوازییەکانیەوە لە ژن و پیاودا. ڕێک هەر بەو جۆرەی کە لیبیدۆ-ئۆبێکت لەسەرەتاوە لیبیدۆ-ئیگۆی لە تێبینیکردنەکانی ئێمە شاردەوە، هەروەها سەبارەت بە هەڵبژاردنی ئۆبێکت[44] لای ساوایان(و منداڵانی ڕووەو گەشە)،

44. object-choice

هەروەها ئەوەی سەرەتا سەرنجی ئێمەی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا ئەوە بوو کە ئەوان ئۆبێکتی ئارەزووی سێکسیی خۆیان بەگوێرەی شێوازی تێربوونەکەیان هەڵدەبژێرن. یەکەمین تێربوونە ئۆتۆ-ئیرۆتیکییەکان لە پەیوەندییدا بەو کارکردە ژینەکییانەوە[45] ئەزموونکراوەکرێن کە مەرامەکەیان بریتییە لە خۆپاراستن. غەریزە سێکسییەکان لەسەرەتاوە دەچنەپاڵ غەریزەکانی ئیگۆ و تەنیا لە قۆناغەکانی دواتردا لەسەر پێی خۆیان ڕادەوەستن. بەڵام تەنانەت لە ساتەوەختی سەربەخۆبوونی غەریزە سێکسییەکانیشدا، دیسان نیشانەی پاشکۆبوونێکی سەرەتاییان پێوەیە، چونکە ئەوانەی بەرپرسن لە خۆراکپێدان و چاودێری و گۆشکردنی مناڵ(واتە لە نیگای یەکەمدا دایکی مناڵەکە یان کەسێکی جێگرەوەی دایک)، دەبنە یەکەمین ئۆبێکتی ئارەزووی سێکسیی ئەو. بەڵام بەتەنیشت ئەم جۆرە هەڵبژاردنەی ئۆبێکت و ئەم سەرچاوەیەی هەڵبژاردنی ئۆبێکتەکەشەوە، کە دەتوانین ناوی‌بنێین پاڵپشتخواز(anaclitic) یان پاشکۆوپەیوەست(attachment)، لێکۆڵینەوە دەروونشیکارییەکان جۆری دووەمی ***هەڵبژاردنەئۆبێکت***[٤٦] یان ئاشکراکردووە کە بە بیرماندا نەدەهات. لەوە تێگەیشتووین کە بەتایبەت ئەو کەسانەی وا گەشەی لیبیدۆکەیان تووشی تێکچوون هاتووە(وەک لادەرە سێکسییەکان

45. Vital

ئاماژەیە بۆ بنەمایەکی ژیانخوازانەی سەروو پرۆسە کیمیایی و فیزیاییەکان کە دیوێکی کەمتر بەرجەستەی هەیە بەڵام هەڵگری دیوە بەرجەستەکانیشە-و

٤٦. هەڵبژاردنەئۆبێکت, هەر بە مانای هەڵبژاردنی ئۆبێکت هاتووە بەڵام بۆیە بەم فۆرمە دامانڕشتەوە لە هەندێ شوێندا چونکە ڕستەکە ئاسانتر دەکات و لە زمانی کوردییشدا شێوازی داڕشتنی فرمانی لەم جۆرەمان هەر هەیە وەک: بردنەپێشەوە, خستنەقوتوو, بەردگرتنەئەویتر و هتد- و

و هاوڕەگەزخوازان)، لە هەڵبژاردنی دواتری ئۆبێکتی عەشقەکەیاندا، نەک دایکیان بەڵکو خودی خۆیانیان وەک مۆدێل هەڵبژاردووە. ئەوان بەڕوونی خۆیان وەک ئۆبێکتی عەشق وەردەگرن و هەڵبژاردنی ئۆبێکتەکەشیان بەجۆرێکە کە دەبێت پێیبڵێین «خودئەڤینانە». تێبینیکردنەکانی ئێمە لەم بوارەدا، بەهێزترین هۆکار بووە کە ئێمەی بەرەو قبوڵکردنی تیۆری خودئەڤینی بردووە.

لەگەڵ ئەمەشدا، ئەو ئەنجامگیرییەمان نەکردووە کە مرۆڤەکان دابەشدەبن بەسەر دوو گرووپی تەواو جیاوازدا- ئەویش بەپێی هەڵبژاردنی ئۆبێکتەکەیان چ لە جۆری پاڵپشتخوازانە بێت یان لە جۆری خودئەڤینی-. بەڵکو گریمانەکەی ئێمە ئەوەیە هەر تاکێک دەتوانێت بەپێی ئەم دوو جۆرە، ئۆبێکتی خۆی هەڵبژێرێت، گەرچی ڕەنگە کەسی ناوبراو یەکێک لەم دوو جۆرەی پێ باشتر بێت. ئێمە دەڵێین مرۆڤ هەر لەسەرەتاوە دوو ئۆبێکتی هەیە بۆ ئارەزووە سێکسییەکانی(خودی خۆی و ئەو ژنەشی کە چاودێریی دەکات و شیری پێ دەدات)، و بەم شێوەیە وایدادەنێین خودئەڤینیی سەرەتایی بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا دێت و ڕەنگە لە هەندێ حاڵەتدا بە شێوەیەکی زەق خۆی لە ***هەڵبژاردنەئۆبێکتی*** کەسەکاندا دەرخات.

بەراوردی نێوان هەردوو ڕەگەزی نێر و مێش ئەوە دەردەخات کە ***هەڵبژاردنەئۆبێکتە***کەیان هەر لەبنچینەوە لەیەک جیاوازن، هەرچەندە ئەم جیاوازییانە گشتەکی و گەردوونی نین. عەشقی تەواو پاشکۆیانە بۆ ئۆبێکتی ئارەزوو، بە مانای تایبەتی وشەکە، سیفەتی پیاوانە. زیادەڕۆیی بەرچاوی

سێکسی لەم جۆرە عەشقەدا، بێگومان لە خودئەڤینیی سەرەتایی منداڵەوە سەرچاوەدەگرێت و بۆیەشە بەهۆی گواستنەوەیەوە خودئەڤینی ڕێکەوتی ئۆبێکتی ئارەزووی سێکسی دەکات. ئەم زیادەڕۆییە سێکسییە سەرچاوەی دۆخی تایبەتیی عاشقبوونە-دۆخێک کە بیرخەرەوەی ئەنگێزەیەکی تۆکمە و عوسابانەشە- و بۆیە دەتوانین هۆکارەکەی لە هەژارکەوتنی ئیگۆ(لەبەر سودمەندنەبوون لە لیبیدۆ) و بڕستی ئۆبێکتی عەشقدا بدۆزینەوە. لە زۆرینەی ئەو ژنانەی وا دەیانناسین(دەشێ داوێنپاکترین و ڕاستگۆترینی ژنانیش)، پرۆسەیەکی جیاواز ڕوودەدات. لەگەڵ دەسپێکی باڵقبوون و پێگەیشتندا، گەشەی تەواوەتیی کۆئەندامی زاوزێی ژنانە کە تا ئەودەم لە دۆخی متبووندا بوو، لەڕواڵەتدا خودئەڤینیی سەرەتایی توندەکاتەوە و ئەمەش کاریگەرییەکی نەخوازراو لەسەر هاتنەدیی ***هەڵبژاردنەئۆبێکتی*** ڕاستەقینە و زیادەڕۆییە سێکسییەکەی هاوشانی جێدەهێڵێت. ژنان، بەتایبەت گەر لە گەورەییدا دەموچاوێکی جوانیان پێوە بێت، لەخۆڕازی دەبن و بەهۆی ئەم هەستەوە ئەو بەربەست و سنوردارێتییە کۆمەڵایەتییانە قەرەبوودەکەنەوە کە بەسەر ***هەڵبژاردنەئۆبێکتە***کەیاندا دەسەپێنرێت. بە دەربڕینێکی دەقیقتر، ئەم جۆرە ژنانە تەنیا عەشقیان بۆ خۆیان هەیە، عەشقێک کە لە تین‌وتاودا لە گەرمیی عەشقی پیاوان دەچێت دەرهەق بەوان. هەروەها پێویستیان بە عاشقبوون نیە، بەڵکو تەنیا دەیانەوێت کەسێک عاشقانە ئەوانیان خۆشبوێت و ئەو پیاوەشی هەڵگری ئەم مەرجە بێت دەبێتە ئەڤینی نێو دڵیان. دەبێت بایەخێکی زۆر بۆ ئەم جۆرە ژنە دابنرێت لە ژیانی ئیرۆتیکیی مرۆڤدا. پیاوان بەتوندی شەیدای ئەم

جۆرە ژنانە دەبن، نەک هەر لەبەر ئەوەی کە جوانن(چونکە عادەتەن جوانترین ژنن)، بەڵکو لەبەر کۆمەڵێک فاکتەری سەرنجڕاکێشی دەروونییش چونکە تەواو ئاشکرایە کە کاتێک بەشێک لە خودئەڤینیی خۆی بەلاوەدەنێت و بەدوای ئۆبێکتی عەشقدا دەگەڕێت، ئیدی خوئەڤینیی کەسێکی تری غەیری خۆی بەلای ئەوەوە سەرنجڕاکێش دەبێت.

سەرنجڕاکێشی و کەمەندکێشیی منداڵ بە ڕێژەیەکی زۆر لە خودئەڤینییەکەیەوە سەرچاوەدەگرێت، لە بەردەستنەبوون و دۆخی لەخۆڕازیبیانەی ئەوەوە، ڕێک هەروەکو سەرنجڕاکێشیی هەندێک لە گیانەوەران کە لەڕواڵەتدا هیچ سەرنجێکمان نادەنێ(وەکو پشیلەکان و گیانەوەرە دڕندە گەورەکان). لەڕاستیدا، تەنانەت تاوانبارە گەورەکان و کەسانی گەپجاڕیش، بەو جۆرەی لە ئەدەبیاتدا دەنوێنرێنەوە، بەو هۆیەوە سەرنجوخولیای ئێمە بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن کە بەجۆرێکی بەردەوام و بە خودئەڤینییەوە دەتوانن لە هەموو ئەو شتانە دووركەونەوە کە ئیگۆکەیان دادەشکێنێت، وەکبڵێی ئیرەییان پێ دەبەین چونکە دەتوانن دۆخی ڕۆحی و ڕەوانیی خۆیان بۆ خۆیان بپارێزن، ئەو دۆخە ئیرۆتیکییە لەناونەچووەی کە ئێمە خۆمان زۆر لەوەو پێش دەستمان لێ شۆرد. هەڵبەت سەرنجڕاکێشیی زۆروزەوەندی ژنانی خودئەڤین، خاڵی پێچەوانەی خۆیشی هەیە. بەشێکی گەورەی تێرنەبوونی عاشق، لە گومانەکانیدا دەرهەق بە ڕاستگۆیی مەعشوق، لە گلەییەکانیدا دەرهەق بە سرووشتی لوغزاویی عەشق، ڕیشەی دەچێتەوە سەر ئەم نەسازان[47]ـەی نێوان جۆرەکانی ***هەڵبژاردنەئۆبێکت***. [بە دەربڕینێکی تر، کاتێک

47. Incongruity

عاشقێک دەڵێت عەشق لوغزە و لێی تێناگەم، ئەوا مەبەستی نەسازانی مەعشووقە کە ئۆبێکتێکی شیاوی هەڵبژاردنی ئەو نەبووە].

ڕەنگە شیاو بێت لێرەدا دڵنیاتان بکەمەوە ئەم وەسفە دەربارەی فۆرمی مێینانەی ژیانی ئیرۆتیکی، لە هیچ جۆرە ئارەزوویەکی مەبەستدارانەوە بۆ سوکایەتیکردن بە ژنان سەرچاوەناگرێت. بەدەر لەوەی ئینتیمادداری و مەبەستداری لە زاتی مندا نیە، دەزانم ئەم ڕێڕەوە جیاوازانەی گەشەکردن، ڕێکەوتدەکەن لەگەڵ ماهیەتی جیاوازی کارکردەکان[ی لەش دا]، ئەویش لە کۆیەتییەکی بایۆلۆژیی هێجگار ئاڵۆزدا. سەرباری ئەوەی دانی پیادەنێم ژنانێکی زۆر هەن کە بەپێی مۆدێلی نێرانە عاشقایەتی دەکەن و هەر بەپێی ئەو مۆدێلەش زیادەڕۆیی سێکسی دەنوێنن.

تەنانەت ژنانی خودئەڤین و خۆپەرستیش، کە هەروا باکیان بە پیاوان نیە، ڕێیەکیان هەیە بۆ عەشقی تەواوەتی بە ڕووی ئۆبێکتەکان[ی دەرەوە]دا. لەو منداڵەشدا کە ئەم ژنانە دەیهێننەدونیاوە بەشێک لە لەشی خۆیان وەک شتێکی دەرەکی ڕووبەڕووی ئەوان دەبێتەوە و پاشان – بەهۆی جێهێشتنی خودئەڤینییەکەیانەوە- دەتوانن عەشقێکی تەواوەتی بە ڕووی ئۆبێکتەکاندا بنوێنن. سەرەڕای ئەمە، ژنانێکی تریش هەن بۆ ئەوەی لە خودئەڤینیی دووەمەوە بپەڕنەوە بۆ عەشقی ئۆبێکتەکان، ئەوا پێویستیان بەوە نیە تا کاتی منداڵبوون دان بە خۆیاندا بگرن. ئەوان بەر لە تەمەنی باڵقبوون، هەستی نێرانەیان هەیە و کەمتازۆر بەشێوەیەکی نێرانە گەشەدەکەن. کاتێک ئەم ژنانە دەگەنە باڵقبوونی نێرانە

و ئەم پرۆسەیە دەوەستێت، ئیدی هێشتاش هەر دەتوانن ئایدیاڵێکی نێرانە بخوازن، ئایدیاڵێک کە لەڕاستییدا درێژەی ژیانی ئەو سرووشتە کوڕانەیەیە[٤٨] کە سەردەمانێک خۆیانی لێ سودمەند بوون.

ئەوەی تا ئێستا بە ئاماژە وتوومە، دەتوانین بە پوختکردنەوەی ئەو ڕێڕەوانەی وا سەردەکێشن بۆ هەڵبژاردنی ئۆبێکتی ئارەزوو، بەم جۆرە کۆکەینەوە:

دەشێت تاکەکەس بە دوو شێوە عاشق ببێت:

**١. بەپێی چەشن(تایپ)ێک کە لەسەر خودئەڤینی ڕۆنراوە:**

ئەلف: خەسڵەتە هەنوکەییەکانی خۆی(بە دەربڕینێکی تر، کەسەکە عاشقی خۆی دەبێت).

بێ: خەسڵەتەکانی ڕابردووی خۆی.

پێ: ئەو خەسڵەتانەی وا حەزدەکات هەیبێت.

تێ: کەسێک کە پێشتر بەشێک بووە لە خۆی.

**٢. بەپێی چەشنێک کە لەسەر پاڵپشتخوازی(پاشکۆیەتی) ڕۆنراوە:**

ئەلف: ئەو ژنەی کە [شیر و] خۆراکی دەداتێ. [= نێرەکان]

بێ: ئەو پیاوەی وا چاودێری و سەرپەرشتیی دەکات. [= مێیەکان]

هەروەها زنجیرەی ئەو کەسانەی وا دەبنە جێگرەوەیان.

بەر لە گەیشتن بە بەشێکی تری باسی ناو ئەم وتارە، ناکرێت هۆیەکی پاساودار بخرێتەڕوو بۆ تێخستنی خاڵی "پێ" لە مۆدێلی یەکەمدا.

48. Boyish

دەبێت بایەخ و دەلالەتی ئەو ***هەڵبژاردنەئۆبێکتە***ی کە لەسەر خودئەڤینیی ناو هاوڕەگەزبازیی پیاوان ڕۆنراوە، لە پەیوەندییدا بە کۆمەڵێک بابەتی ترەوە تاوتوێ بکەین.

کەمتر دەتوانین لەڕێگەی تێبینیکردنی ڕاستەوخۆوە بگەین بەو خودئەڤینییە سەرەتاییەی وا گریمانەمانکرد لە منداڵاندا هەبێت-و یەکێکیشە لە پرەنسیپە بنجبڕەکانی تیۆرەکانمان لەمەڕ لیبیدۆ-، بەڵام دەکرێت بەهۆی دەرکێشانی لە بابەتێکی ترەوە پشتڕاستی بکەینەوە. گەر تێڕوانینی دایکوباوکی میهرەبان بۆ ڕۆڵەکانیان تاوتوێبکەین، ئەوا تێدەگەین ئەو تێڕوانینە لەڕاستیدا زیندووکردنەوە و بەرهەمهێنانەوەی خودئەڤینییەکەیانە کە دەمێک بوو وازیان لێ هێنابوو. وەک ئەوەی هەمووشمان دەیزانین، ئەو نیشانکردە بنجبڕەی وا زیادەڕۆیی (ی سێکسی و عاتفی بۆ ئۆبێکتی ئارەزوو) دەخاتەڕوو و پێشتر بە نیشانەی خودئەڤینیمان داناوە لە هەڵبژاردنی ئۆبێکتدا، بەسەر ڕوانینی عاتفیی دایکوباوکدا زاڵە. سەرەنجام، ئەوان بەشێوەیەکی پێداگرانە حەزدەکەن هەموو کامڵبوونەکان بدەنەپاڵ منداڵەکەیان(دیارە تێبینیکردنی نازیادەڕۆیانە هیچ هۆ و بیانوویەک بۆ ئەمە ناخاتەڕوو) و هەموو عەیبە و کەموکورتییەکانی ئەویش دەشارنەوە(لە پەراوێزیشدا خراپ نیە ئاماژەیەک بەوە بکەین کە نکۆڵیکردنی دایکوباوک دەرهەق بە بوونی ئارەزووی سێکسی لە منداڵاندا پەیوەندیی بەم خاڵەوە هەیە). وێڕای ئەمەش، ئەوان حەزدەکەن کۆی ئەو دەسکەوتە کەلتورییانەی کە خودئەڤینییەکەیان ناچارکراوە ڕێزیبگرن، لەبەر خاتری منداڵەکەیان هەڵپەسێرن و لەجیاتیی وی سەرلەنوێ خوازیاری ئەو ئیمتیازاتەن کە خۆیان دەمێک لەوەوبەر وازیان لێهێنابوو.

مناڵەکەی وان سەردەمێکی باشتری لە داکوبابی دەبێت و ناچارنابێت ملکەچی ئەو زەروورەتانە بێت کە بە بۆچوونی وان لە ژیاندا فرەگرنگن. نەخۆشی، مردن، چاوپۆشی لە چێژ و سنورداربوونی ئیرادەی، هەرگیز کاری لێ ناکات. بۆ ڕازیبوون و خۆشنودیی خۆی، یاساکانی سرووشت و کۆمەڵگا پووچەڵدەبنەوە و جارێکی تر هەربەڕاستی دەبێتەوە بە چەق و کرۆکی وجود: «جەنابی ئەوی مناڵ[49]»، هەر بەو جۆرەی سەردەمانێک ئێمەش وا سەیری خۆمانمان دەکرد. مناڵ ئەو خەونە ئارەزوومەندانەیەی داکوباب دێنێتەدی کە هەرگیز نەهاتبوونەدی: لەجیاتیی باوکی، دەبێتە پیاوێکی گەورە و پاڵەوان و کچەی مناڵکاریش لەگەڵ شازادەیەکدا زەواجدەکات، ئەویش بۆ قەرەبووکردنەوەی دۆخی درەنگکەوتووی دایکی. لە هەستیارترین پنتی سیستەمی خودنەڤینانەدا، مەبەستم نەمرییەکەی ئیگۆیە کە لەژێر پاڵەپەستۆی توندی واقیعدایە، مناڵ ئەو داڵدەیەیە دەبێتەهۆی ئارامیی داکوبابی خۆی. میهر و مەحەبەتی داکوباب، کە زۆر ڕەحمبزوێن و زۆریش مناڵانەیە، هیچ نیە جگە لە خودنەڤینیی زیندەوەبووی داکوباب کە کاتێک دەبێتە ئۆبێکتی ئارەزوو بۆیان ئیدی بەشێوەیەکی گردەبڕ سیفەتەکانی پێشووی وان هەڵدەداتەوە.

49. His Majesty the Baby



بەدگۆڕانی نەرجس(نارسیس)، وێنەکێشی سوریالی: سالڤادۆر دالی

# سێ

ئەو پشێوییانەی هەڕەشە لە خودئەڤینیی سەرەتایی منداڵ دەکەن، ئەو کاردانەوانەی منداڵ بۆ خۆپاراستن لەو پشێوی و ڕێڕەوانەی کە منداڵ بۆ دەرخستنیان بەناچار پەلکێشدەکرێت بۆیان- ئەمانە کۆمەڵێک بابەتی گرنگن کە هێشتا نەخراونەتە ژێر توێژینەوەوە، بەڵام من مەبەستمە بە کرۆکپی جێیان بێڵم. بەڵام دەتوانین گرنگترین بەشی ئەم بابەتانە وەک گرێی "خەسان" دەستنیشانکەین(لە کوڕاندا دڵەڕاوکێی لەدەستدانی زەکەر و لە کچۆڵانیشدا حەسرەتخواردن بۆ هەبوونی زەکەر)، و لە پەیوەندییدا بە کاریگەریی قەدەغەکردنی سەرەتایی چالاکیی سێکسییەوە بیپشکنین. لێکۆڵینەوەی دەروونشیکارانە عادەتەن ئەو توانایەمان پێ دەبەخشێت شوێنپێی ناسەقامگیریی غەریزە لیبیدۆییەکان هەڵگرین(ئەو دەمەی لە غەریزەکانی ئیگۆ جیابوونەتەوە و دەکەونە بەرامبەریانەوە). بەڵام لە پانتایی تایبەتی گرێی ئۆدیبدا، لێکۆڵینەوەی دەروونشیکارانە هەڵێنجانی وجودی قۆناغبەندی و دۆخێکی دەروونی دەڕەخسێنێت کە هەردوو گرووپەکەی

سەر بەم غەریزانە هێشتاش لە یەکێتییەکدا لەگەڵ یەکتردا لەگەڕدابوون و بەشێوەیەکی توندوتۆڵ بەیەکداچووبوون و ڕواڵەتی خولیای خودئەڤینیان گرتبووە خۆیان. ئەدلەر، چەمکی **نارەزایەتیی نێرانە**(masculine protest)ی لەسەر بنەمای ئەم چوارچێوەیە گەڵاڵەکردووە. ئەم چەمکەی تەقریبەن تا ئاستی تاکە هاندەری درووستبوونی کەسایەتی و عوسابیش بەرزکردووەتەوە و کۆڵەکەکەشی بە بەهادانانی کۆمەڵایەتی دەزانێت -نەک مەیلێکی ڕۆنراو لەسەر خودئەڤینی و پەیوەست بە لیبیدۆوە-. لێکۆڵینەوەی دەروونشیکارانە هەر لەسەرەتاوە دەستی خستووەتە سەر وجود و گرنگیی «نارەزایەتیی نێرانە»، بەڵام بەپێچەوانەی ئەدلەرەوە پێیوابووە هەڵگری سیفەتی خودئەڤینانەیە و لە گرێی ئۆدیبەوە سەرچاوەدەگرێت. «نارەزایەتیی نێرانە» لە پێکهێنانی کەسایەتی‌دا بەشدارە و هاوشان بە زۆر فاکتەری تر پێکیدەهێنێت، بەڵام بۆ ڕوونکردنەوەی کێشەکانی سەر بە عوساب تێکڕا نەگونجاون(کە ئەدلەر سەرنج ناخاتە سەر هیچ دیوێکیان، جگە لەوەی عوسابەکان چۆنچۆنی دەچنە خزمەتی غەریزەکانی ئیگۆوە). بە بڕوای من، شتێکی مەحاڵە شێوازی درووستبوونی عوساب لەسەر کۆڵەکەیەکی بەرتەسکی وەک گرێی خەسان ڕوونکەینەوە، ئیدی بە چاوپۆشی لەوەش کە گرێی ناوبراو بە چ گرۆتینێکەوە ڕەنگە وەک یەکێک لە بەرهەڵستییەکانی[٥٠] پیاوان خۆی قوتبکاتەوە. لە پەراوێزدا،

---

٥٠. بەرهەڵستی(resistance)، میکانیزمێکی بەرگرییە کە بەشە سەرکوتکراوەکەی ئیگۆ دەخرێتەگەڕ تا دۆخی دەروونیی تاک بەو جۆرەی هەیە پارێزراو بێت، و ببێتە ڕێگر لەبەردەم مەیل و بیرەوەرییە نەستەکییەکانی ئەو کەسەدا بەرەو ناو ئاگایی ئەو کەسە. ئاکامی بەرهەڵستی بریتییە لە هەستکردن بە دڵەڕاوکێ(و. ف).

ئەم بابەتە بە شیاوی باس دەزانین کە هەندێک لە توشبووانی عوسـاب شـکدەبەم کـە «نارەزایەتیی نێرانـە» لەوانـدا -یـان بـە بۆچوونـی ئێمـە گرێـی خەسـان- ڕۆڵـی نەخۆشـخەری نیـە و بگـرە هـەر درووستیشـنابێت.

تێبینیکردنـی کەسـانی پێگەیشـتووی نۆرمـاڵ گـوزارشـتە لـەوەی کـە خۆبەزلزانییەکـەی پێشـوویان جلّەوکـراوە و ئـەو تایبەتمەندییـە دەروونییـەی وا نیشـانەی خودئەڤینیی منالانەی وان بـوو سـڕاونەتەوە. ئـەی لیبیدۆ-ئیگۆی وان چیی بەسـەر هاتـووە؟ ئاخـۆ دەبێت گریمانـەی ئـەوە بکەین کۆی ئـەو وزەیە گـوازراوەتـەوە بـۆ خـەرجکردن و خاڵیکردنـەوەی دەروونـی لە ئۆبێکتـی ئـارەزووەدا؟ بەئاشـکرا ئـەم ئیمکانـە پێچەوانـەی کـۆی ڕەوتـی باسـەکەمانە، سـەرباری ئەمـەش دەتوانیـن سـەرەداوی وەلامێکـی تـری ئـەم پرسـیارە لـە دەروونناسـیی چەپانـدن[51]دا بدۆزینەوە.

لەوە تێگەیشـتووین هەرکە هاندەرە غەریزییە لیبیدۆییەکان دژی بیروبـاوەڕە کەلتـوری و ئەخلاقییەکانـی تـاک وەسـتانەوە ئیدی تووشـی گـۆڕان و چەپاندنـی نەخۆشـخەر دەبـن. دیـارە مەبەسـتمان لـە باسـکردنی ئەمـە، ئـەوە نیـە کەسـی ناوبـراو زانینێکـی تـەواو فیکـری [یـان ئاگایانە]ـی دەرهـەق بـە بوونـی ئـەم بیروباوەڕانـە هەیـە، بەڵکـو هـەردەم مەبەسـتمان ئەوەیـە بیروباوەڕگەلی ناوبراو بۆ ئەو کە پێوەر و پێوانەن و ملکەچی ئـەو شـتانە دەبن وا ئـەو بیروباوەڕانە بۆی دەسـتنیشـاندەکەن. بـەر لەمـەش وتوومانـە چەپاندن لە ئیگۆوە سـەرچاوەدەگرێت، ئێسـتا دەتوانیـن بەشـێوەیەکی وردتـر بڵێیـن چەپانـدن لـە

51. psychology of repression

عیزەتنەفسی ئیگۆ[52]وە هەڵدەقوڵێت. هەمان جێکەوتی زەینی، ئەزموون، هاندەر و ئارەزوو کە کەسێک بۆ خۆی دەیەوێت یان لای کەمییەکەی ئاگایانە بیری لێ دەکاتەوە، ڕەنگە کەسێکی تر بەوپەڕی توورەبوونەوە ڕەتیکاتەوە یان تەنانەت بەر لەوەی بگەنە نێو ئاگایی، خەفەیانبکات. دەتوانین بەئاسانی جیاوازیی نێوان ئەم دووانە-کە هەڵگری فاکتەری مەرجی و مەرجسازی چەپاندنن- بە شێوازێک دەرببڕین کە لێکدانەوەکەشی بەپێی تیۆری لیبیدۆ دەرەخسێنێت. بەم شێوەیە، دەتوانین بڵێین یەکێک لەم دوو کەسە ئایدیاڵێکی لە خۆیدا خولقاندووە کە مەحەکی هەڵسەنگاندنی ئیگۆ کردەکی و واقیعییەکەیەتی، لەکاتێکدا ئەویتریان ئایدیاڵێکی لەم جۆرەی نیە. بۆ ئیگۆ، درووستبوونی ئایدیاڵێک فاکتەری مەرجیی چەپاندنە.

*ئیگۆ ئایدیال* لەم قۆناغەدا هەر ئەو خۆ-خۆشویستنەیە کە ئیگۆ فیعلی و واقیعییەکە لە منداڵیدا لێی سودمەند بوو. خودنەڤینیی کەسەکە ئێستا لەم *ئیگۆ ئایدیالە* تازەیەدا دەردەکەوێت کە —هەروەکو ئیگۆی قۆناغی منداڵی- پێیوایە هەرچی کامڵبوونی بەنرخە هەیەتی. هەروەکو هەموو حاڵەتەکانی تر کە لیبیدۆی تیا بەشدارە، مرۆڤ لەم حاڵەتەشدا دەریخستووە ناتوانێت دەست لەو شتە هەڵگرێت وا سەردەمانێک مایەی تێرکردنی بووە. مرۆڤ نایەوێت لە کامڵبوونە نەرجسییەکەی منداڵیی خۆی پاشگەزبێتەوە و ئەو کاتەشی لە گەشەدایە، سەرکۆنەی ئەوانیتر و وورووژانی داوەرییە پەلپگیرەکانی خۆی دەبێتەهۆی تێکچوونی خۆی، و بۆیەشە چیدی ناتوانێت ئەو کامڵبوونە بۆ خۆی بپارێزێت،

52. self-respect of the ego

ئەودەم هەوڵدەدات لە بەرگێکی نوێدا واتە لە بەرگی ئیگۆ *ئایدیاڵێکدا* بەدەستی بهێنێتەوە. ئەوەی ئەو وەک ئایدیاڵ دەیخاتە بەرامبەر خۆی، جێنشینێکە بۆ خودئەڤینیی لەدەستچووی منداڵیی خۆی، خودئەڤینییەک کە بەو پێیە ئایدیاڵی خودی خۆی بووە.

ئەم باسە بەشێوەیەکی سرووشتی بەرەو تاوتوێکردنی پەیوەندیی نێوان پێکهاتنی ئایدیاڵێک و بڵندبوونەوە(sublimation)مان دەبات. بڵندبوونەوە، پرۆسەیەکە بەستراوەتەوە بە لیبیدۆ-ئۆبێکتەوە کە لەو میانەیەدا غەریزە خۆی بەرەو ڕێڕەوێکی جیا لە تێربوونی سێکسی و دوور لەوە ئاراستەدەکات. لەم پرۆسەیەدا، دوورکەوتنەوە لە ئۆبێکتە سێکسییەکان پشترِاستدەکرێتەوە. بەئایدیاڵکردن و ئایدیالیزەبوون، پرۆسەیەکە ئۆبێکتەکانی ئارەزوو دەگرێتەخۆی. لەڕێگەی ئەم پرۆسەیەوە، ئۆبێکتی ئاماژەبۆکراو بەبێ ئەوەی گۆڕان بەسەر ماهیەتەکەیدا بێت، لە زەینی کەسەکەدا گەورە و باڵا و بڵند دەبێتەوە. بەئایدیاڵکردنیش هەم لە پانتایی **لیبیدۆ-ئیگۆ** و هەم لە پانتایی لیبیدۆ-ئۆبێکتیشدا لەئارادایە. بۆنمونە، زیادەڕۆیی سێکسی لە ئۆبێکتێکدا، بریتییە لە ئایدیالیزە و بەئایدیاڵکردنی ئەو ئۆبێکتە. دەتوانین لەو ڕووەوە هەردوو چەمکی **بەئایدیاڵکردن** و **بڵندبوونەوە** لێکدی جیاکەینەوە کە بڵندبوونەوە پەیوەندیی بە غەریزەوە هەیە و بەئایدیاڵکردنیش پەیوەندیی بە ئۆبێکتی ئارەزووەوە.

زۆرجار درووستبوونی *ئیگۆ ئایدیال* بەهەڵە تێکەڵ بە "بڵندبوونەوەی غەریزە" دەکرێت و کێشە دەخاتە

تێگەیشتنمانەوە دەرهەق بە ڕاستییەکان. ناتوانین بڵێین ئەو کەسەی وا خودئەڤینییەکەی خۆی گۆڕیوە بۆ ڕێزدانان لە ئیگۆ *ئایدیاڵێک*، تەنیاوتەنیا بەهۆی ئەم کارەوە بڵندبوونەوەی غەریزە لیبیدۆییەکانی سەریگرتووە. خۆ ڕاستە ئیگۆ *ئایدیال* داوای بڵندبوونەوەیەکی وەها دەکات، بەڵام ناتوانێت بیسەپێنێت. بڵندبوونەوە پرۆسەیەکی تایبەتە و ئایدیاڵ دەتوانێت بیخولقێنێت، بەڵام پیادەکردنی **بڵندبوونەوە** بەشێوەیەکی تەواو سەربەخۆ ڕوودەدات. ڕێک لە توشبووانی عوسابدایە کە بالاترین جیاوازیی نوستوو بەدیدەکەین لەنێوان گەشەی ئیگۆ *ئایدیاڵی* ئەوان و بڕی بڵندبوونەوەی غەریزە لیبیدۆییە سەرەتاییەکانیاندا، و بەگشتییش قەناعەتپێکردنی مرۆڤی ئایدیاڵگەرا زۆر سەختترە لیبیدۆی خۆی بەرەو ئۆبێکتی نەشیاو ئاراستەبکات بەراورد بە کەسێکی ئاسایی کە تا ئەو ڕادەیە پڕ تڕوفیز نیە. سەرباری ئەمەش، دروستبوونی ئیگۆ *ئایدیاڵێک* و **بڵندبوونەوە** پەیوەندییەکی تەواو جودایان بە هۆکاری دروستبوونی عوسابەوە هەیە. هەر بەو جۆرەی پێشتریش بینیمان، دروستبوونی ئیگۆ *ئایدیال*، داواکانی ئیگۆ توندتردەکاتەوە و بەهێزترین پاڵپشتی چەپاندنیشە. [لەبەرامبەردا] بڵندبوونەوە جۆرێکە لە دەرچوون و هەڵهاتن، ڕێیەک بۆ هێنانەدیی ئەو داوایانە **بەبێ** ئەوەی بچەپێنرێن.

نابێت دۆزینەوەی بریکارێکی دەروونی کە تێربوونی خودئەڤینانە لە ئیگۆ *ئایدیال* مسۆگەردەکات و بە هەمان مەبەست بەردەوام چاودێریی ئیگۆ فیعلییەکە دەکات و بەو ئایدیاڵە هەڵیدەسەنگێنێت، جێی سەرسوڕمانمان بێت. گەر بریکارێکی لەم جۆرە بوونی نەبێت، ئەوا ڕێیتێناچێت بتوانین کەشفی بکەین، بەڵکو تەنیا دەتوانین

دەستنیشانیبکەین، چونکە دەتوانین وابیرکەینەوە ئەوەی پێیدەڵێین ویژدان(conscience) هەڵگری ئەو سیفەتانەیە وا پێویستن.

دەستنیشانکردنی ئەم بریکارە دەروونییە، ئیمکانی تێگەیشتنی ئەو وەهمەمان بۆ دەرەخسێنێت کە پێیدەوترێت **لەبەر سەرنجی ئەوانیتردابین**[53]، یان بە دەربڕینێکی درووستتر «لەژێر چاودێریی[54] ئەوانیتردابین». وەهمی ناوبراو، لە نیشانەی زەقی نەخۆشییە پارانۆیاییەکانە و دەکرێت لە شێوەی نەخۆشییەکی دابڕاودا ڕوودات، یان هاوشان بە *عوسابی گواستنەوە* بقەومێت. نەخۆشی تووشبوو بەم وەهمە، گازندەی ئەوە دەکات کە ئەوانیتر فیکروزیکری ئەو دەخوێننەوە و دایم چاویان بە شوێنیەوەیەتی. درک بە ڕۆڵوکارکردی ئەم بریکارە دەکات، ئەویش لەو دەنگانەدا کە بەدیاریکراوی بەهۆی کەسی سێیەم [ـی تاکەوە] دەدوێن(«ئەو ژنە هێشتاش هەر بیر لەم بابەتە دەکاتەوە»، «ئەو پیاوە خەریکە دەڕواتەدەرەوە»). ئەم گلەوگازندەیە، پاساوی خۆی هەیە و گوزارشت لە حەقیقەتێک دەکات. ئەو دەزگا بەهێزەی وا ئێمەی خستووەتە ژێر چاودێرییەوە، بیرمان کەشفدەکات و هەموو نیەت و مەرامەکانمان دەخاتە بەر ڕەخنە، هەر بەڕاستی بوونی هەیە. لەڕاستیدا، ئەم دەزگایە لە ژیانی ئاسایی هەر یەکێکماندا هەیە.

وەهمی ***لەژێر چاودێریدا بوون***، بەشێوەیەکی ئاوەژوو ئەم دەزگا بەهێزەمان پێ دەناسێنێت و بەم شێوەیە سەرچاوە و هۆکاری یاخیبوونی نەخۆشەکەمان بۆ ڕووندەکاتەوە دژ

53. ...of being noticed

54. watch

بەو. چونکە ئەوەی نەخۆشەکەی دەرهەق بە درووستبوونی ئیگۆ *ئایدیال* ناچارکرد(«ئەو ئیگۆ ئایدیالەی کە ویژدان لەجیاتییەکەیدا هەروەکو چاودێرێک کاردەکات»)، لە کاریگەریی ڕەخنەیی دایکوباوکەوە سەرچاوەیگرت(ئەو ڕەخنەیەی کە لەڕێگەی دەنگەوە دەگەیەنرێتە نەخۆشەکە). بە تێپەڕینی کات، ئەو کەسانەی نەخۆشەکەیان [لە دەزگا پەروەردەییەکاندا] پەروەردەکرد و ئەو کۆمەڵە بێشومار و دەرەوەسفەی هەموو ئەوانەی لە ژینگەکەی ئەودا بوون(کەسانی هاوشێوەی خۆی) و هەروەها بیروباوەڕی گشتیش، لەم ڕووەوە کارکردێکی وەک کارکردی ڕەخنەیی دایکوباوکی نەخۆشەکەیان هەبوو.

بەم شێوەیە، بڕێکی زۆری لیبیدۆی بەزات هاوڕەگەزباز بەشداردەبێت لە درووستبوونی *ئیگۆ ئایدیالی* کەسی خودنەڤیندا، و بەهۆی پاراستنیەوە، پەناگەیەک دەسازێنێت و دەبێتە مایەی تێربوونی. درووستکردنی ویژدان لەبنەڕەتدا دەرکەوتە و بەرجەستەبوونی یەکەمین پیتک و ڕەخنەبازیی دایکوباوکە و دواتریش هی کۆمەڵگا. کاتێک بۆ یەکەمجار قەدەغەکردنێک یان بەربەستێک لەبەردەم ئەنجامدانی کارێکدا و لەبەردەم کەسەکەدا قوتدەکرێتەوە، ئیدی مەیلی چەپاندن دێتەئاراوە، و ئەمەش دووبارەبوونەوەی پرۆسەی درووستبوونی ویژدانە. نەخۆشیی وەهم، ئەم دەنگانە و ئەو کەسە زۆرانەش سەرلەنوێ دەخاتەوە بەر چاودێری و بەم شێوەیە پەرەسەندنی ویژدان بەشێوەیەکی *گەڕاوە*[55] دووبارەدەبێتەوە. بەڵام یاخیبوون دژی ئەم "دەزگا سانسۆرکەر"ـە لە ئارەزووی کەسەکەوە

55. Regressively

سەرچاوەدەگرێت(ئەو ئارەزووەی کە لەگەڵ ماهیەتی بنەڕەتیی نەخۆشییەکەیدا تەبایە)، ئارەزوو بۆ ئازادکردنی خۆی لە کۆتوبەندی تەواوەتیی ئەم فاکتەرانە-و بە پلەی یەکەمیش کاریگەریی دایکوباوک- و گەڕاندنەوەی لیبیدۆی هاوڕەگەزخوازانە لەوانەوە. لەوە بەدوا، ویژدانی کەسەکە بەشێوەیەکی پاشەکشەکراو و لە بەرگی کارتێکەرێکی دوژمنکارانەدا لە دەرەوە ڕووبەڕووی وی دەبێتەوە.

گازندەی پارانۆیایی و وڕێنەچییانیش ئەوە دەردەخات کە لەبنەڕەتدا خۆسەرزەنشتکردنی ویژدان لەگەڵ ئەو خۆ-تێبینیکردنەدا ڕێکدەکەوێت کە لەسەری بنیاتنراوە. بەم جۆرە، چالاکیی ئەو زەین و دەروونەی وا کارکردی ویژدانی لەئەستۆدایە، لە خزمەتی هاتنەدیی ناوەکییشدایە و فەلسەفە لەم ڕێگایەوە ماتریاڵ و کەرەستەی پێویست بۆ چالاکییە هزرییەکانی خۆی بەدەستدێنێت. ئەگەری هەیە ئەم کەرەستەیە کاریگەری بخاتە سەر ئینتیمای تایبەتمەندانەی پارانۆیاییەکان لە پێکهێنانی سیستەمە گریمانکارییەکاندا[٥٦].

گەر هەندێ بەڵگە و گەواهی لەسەر چالاکیی ئەم بریکارە چاودێر و پێتکدەرە لە پانتاییەکانی تردا ببینرێت-کە بەهۆی توندبوونەوە وەردەگەڕێت بۆ ویژدان و ناخنشینیی فەلسەفی-، ئەوا ئەمە بە یەقینەوە گرنگیی بۆ ئێمە هەیە. ئەوەی لێرەدا هێربەرت سیلبرەر[٥٧]ناوینائوە «دیاردەی

٥٦. حەزدەکەم بە کورتی نەک تێروتەسەلی، ئەوەی بۆ زیادبکەم کە دروستبوون و بەهێزبوونی ئەم دەزگا چاودێرە دەشێت پێکهاتنی دواتری زاکیرە(ی زەینی) و فاکتەری زەمەن بگرێتەوە(کە ئەمەی دوایی هیچ بەکارهێنانێکی لە پرۆسە نەستەکییەکاندا نیە). (فرۆید)

57. Herbert Silberer

کارکردی[58]»، شتێکی لەسەر دەڵێم کە بێگومان لەو چەند بۆچوونە بەنرخە زیادکراوەی سەر تیۆری خەونەکانە. وەک دەیزانین، سیلبرەر سەلماندوویەتی کە لە حاڵەتی نێوان خەو و بێداریدا دەتوانین ڕاستەوخۆ تێبینیی گۆڕینی بیرەکان بکەین بۆ وێنەی دیدەکی و بینراو، بەڵام لە زۆربەی ئەم ڕەوشانەدا نواندنەوەی ڕەوشی کردەکیی کەسێکمان هەیە کە بەرهەڵستی بە ڕووی خەودا دەنوێنێت(ویست و ئیشتیا، داهێزران، و هتد)، نەک نواندنەوەی ناوەڕۆکی بیرێک(بیر-خەون). ئەو بە ڕێگەی یەکەم دەریخستووە کە شێوازی کۆتاییهاتنی هەندێک لە خەونەکان یان هەندێک لە بەشبەندیی لە ناوەڕۆکەکەیاندا، تەنیا گوزارشتە لە درکی کەسی خەوبین دەرهەق بە خەو و بێدارییەکەی خۆی. سیلبرەر بەم شێوەیە ڕۆڵی تێبینیکردنی لە دروستبوونی خەوندا ئاشکراکردووە(ئەویش لەڕێگەی چەمکی وەهمەکانی کەسی پارانۆیاییەوە کە گوایە لەژێر چاودێریدایە). تێبینیکردن لە هەموو خەونەکاندا هەمان ڕۆڵ ناگێڕێت. سەرنجەدانی من بۆ ئەم فاکتەرە، دەشێت لەوێوە سەرچاوەبگرێت کە تێبینیکردن لە خەونەکانی خۆمدا ڕۆڵێکی گرنگی نیە. ڕەنگە لەو کەسانەدا وا لەڕووی فەلسەفییەوە بەهرەمەندن و خوویان بە خودئەندێشی و ناخگەرییەوە گرتووە، تێبینیکردن ڕۆڵێکی دیار وەرگرێت.

جێی خۆیەتی ئەوە بیربێنینەوە کە بەپێی دۆزینەوەکانمان، خەون لەژێر دەسەڵاتی بریکارێکی سانسۆرکاردا دروستدەبێت کە [نەست] ناچاردەکات بیرە حەشاردراوەکانی ناو خەون بەلاڕێدا ببات. بەڵام ئێمە ئەم سانسۆرەمان بە

58. functional phenomenon

هێزێکی تایبەت دانەنا، بەڵکو ئەم زاراوەیەمان بۆ ئاماژەکردن بە دیوێکی مەیلە چەپێنەرەکان هەڵبژارد کە بەسەر ئیگۆدا زاڵن، واتە ئەو دیوەی کە ڕووەو بیرە حەشاردراوەکانی ناو خەون دەڕۆن. ئەگەر زیاتر بونیادی ئیگۆ تاوتوێ بکەین، ئەوا دەتوانین سانسۆرکەرەکەی خەون[٥٩]یش لە ئیگۆ *ئایدیال* و دەربڕینە دینامیکییەکانی ویژدان جیاکەینەوە.

ئەو مەسەلەیەی کە سانسۆرکارەکە تەنانەت لە ساتی خەوەکەشماندا بڕێک بێدارە، تێدەگەین خۆتێبینیکردن و خۆڕەخنەکردنەکەی چۆنچۆنی کاردەکاتە سەر ناوەڕۆکی خەونەکە(خۆڕەخنەکردنی هاوشێوەی«ئێستا لەوە خەواڵووترە بتوانێت بیربکاتەوە» یان «ئێستا خەریکە لە خەو ڕادەبێت»)[٦٠].

لێرەدا دەتوانین هەوڵی ئەوە بدەین کەمێک باسی ڕوانینی مرۆڤی نۆرماڵ و نەخۆشانی عوساب بکەین لەمەڕ عیزەتی‌نەفس یان ڕێزلەخۆگرتن(self-regarding).

لە نیگای یەکەمدا، ڕێزلەخۆگرتن هەر بە ئەندازەی ئیگۆ دەردەکەوێت بۆمان، ئەوەی کە کامە ڕەگەزی جیاجیا ئەم ئەندازەیە دیاریدەکەن پەیوەندیی بە باسەکەمانەوە نیە. ئەوەی تاکەکەسێک هەیەتی یان بەدەستیدەهێنێت، باقیی هەستی بەدەوییانەی هەمەتوانایی کە ئەزموونەکانی پشتڕاستیدەکەنەوە، یارمەتیی هەڵکشانی ڕێزلەخۆگرتنەکەی دەدەن.

---

59. dream-censor

٦٠. لەم قۆناغەی باسەکەدا هێشتاش هەر ناتوانین ئەوە دەشتنیشانکەین ئاخۆ جیاکاریی نێوان «ئید»ی سانسۆرکار و باقیی [«بونیاد»]ی ئیگۆ دەتوانێت کۆڵەکەی جیاکاریی فەلسەفیی نێوان ئاگایی و نەست بێت یان نا. (فرۆید)

لە جیاکاریی نێوان غەریزە سێکسییەکان و ئیگۆدا، دەبێت ئاگامان لەوە بێت کە ڕێزلەخۆگرتن بەتایبەت و بە بڕێکی زۆرەوە پێویستی بە لیبیدۆیەکی خودئەڤینانە و نەرجسییە. دوو حەقیقەتی بنەڕەتی هەن ئەم دیدگایە پشتڕاستدەکەنەوە: [یەکەمیان] تووشبوون بە پارافرینیا ڕێزلەخۆگرتن دەباتە سەرەوە، لەکاتێکدا لە *عوسابی گواستنەوە*دا ڕێزلەخۆگرتن دادەبەزێت. [دووەمیشیان] لە پەیوەندییە ئەویندارییەکاندا خۆشنەویستران هەستی ڕێزلەخۆگرتن کەمدەکاتەوە، لەکاتێکدا خۆشویستران توندیدەکاتەوە. وەکچۆن پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد، ئامانجی ***هەڵبژاردنەئۆبێکتی*** خودئەڤینانە و هەروەها ئەوەشی کە ئەم هەڵبژاردنە دەکاتە مایەی تێربوون، بریتییە لە خۆشویستران.

بەئاشکراش دەتوانین ئەوە ببینین کە خاڵیبوونەوەی لیبیدۆیی لە ئۆبێکتی ئارەزوودا، نابێتەهۆی هەڵکشانی ڕێزلەخۆگرتن. شوێنەواری هەستی پێویستبوون بە مەعشوق(ئۆبێکتی عەشق)، کەمبوونەوەی ڕێزلەخۆگرتنە. خەسڵەتی کەسی عاشق، سووکی و زەبوونی‌یە. بە دەربڕینێکی تر، کەسی عاشق بەشێک لە خودئەڤینییەکەی خۆی بەخشیوە [بە عەشقەکە] و تەنیا بەهۆی ئەو هەستەوە دەتوانێت قەرەبووی بکاتەوە کە هەستدەکات خۆیشی هەر مەعشوق [و خۆشویستراوە لە پەیوەندییەکەدا]. لە هەموو ئەم ڕووانەوە، ڕێزلەخۆگرتن وەک ڕەگەزێکی خودئەڤینی دەردەکەوێت لە عەشقدا.

پەیبردن بە نەتوانینی سێکسی-و نەتوانینی عەشق- لەبەر شێوانی دەروونی یان جەستەیی، بڕێکی زۆر زۆر

لە ڕێزلەخۆگرتن کەمدەکاتەوە. بە بڕوای من، دەبێت لەم ڕووەوە یەکێک لە سەرچاوەکانی هەستی خۆبەکەمزانین تاوتوێ بکەین، هەستێک کە تووشی نەخۆشانی سەر بە *عوسابی گواستنەوە* دەبێت و بەبێ هیچ ڕووگیربوونێک لای دەروونشیکارەکەیان دەیدرکێنن. بەڵام سەرەکیترین سەرچاوەی ئەم هەستانە، بریتییە لە تیاماوی و داماویی ئیگۆ بەهۆی ئیهمالیی کەسەکەوە دەرهەق بە خەرج و خاڵیبوونەوە زۆرگەورە دەروونییە لیبیدۆییەکان لە ئۆبێکتی ئارەزوودا. بە دەربڕینێکی تر، دەتوانین بڵێین سەرچاوەی سەرەکیی ئەم هەستانە ئەو زەبر و هێدمەیەیە کە لەلایەن ئەو مەیلە سێکسییانەوە کراوەتە ئیگۆوە وا جڵەوناکرێن.

ئەدلەر (١٩٠٧)، بەدرووستی پێیوایە کاتێک کەسێک ژیانێکی زەینیی چالاکی هەیە ئیدی لە بێتوانایی یەکێک لە ئەندامەکانی لەشی تێدەگات، و ئەو بێتواناییەش بیانوویەکە بۆ ئەوەی بە کردەیەکی زیاترەوە و بە شێوەیەکی زیادەڕۆیانەتر قەرەبووی بکاتەوە. بەڵام بەگشتی شتێکی زیادەڕۆیانەیە گەر بێتو بە پەیڕەویکردنی ئەدلەر بمانەوێت هەر دەسکەوتێکی سەرکەوتووئامێز بە دەرهاویشتەی ئەم فاکتەرە بزانین(واتە بێتوانایی سەرەتایی ئەندامێک). ناتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین هونەرمەندان هەر هەموو تووشی چاوکزی[٦١] هاتوون، ناشتوانین بڵێین هەموو وتاربێژێک لاڵەپت[٦٢]ـە.

بەهەرحاڵ، دەتوانین نمونەی زۆرکەس بێنینەوە کە بەهۆی هەبوونی ئەندامی بەتواناتری جەستەییەوە گەیشتوون

61. bad eyesight

62. stammerer

بە کۆمەڵێک سەرکەوتنی بەرچاو؛ بێتوانایی و گەشەی نیوەناچڵی ئەندامەکانی جەستە ڕۆڵێکی گرنگ لە هۆکارناسیی عوسابەکاندا ناگێڕێت، بەڵکو گرنگییەکەی تەقریبەن لە ئاستی ڕۆڵی درکەکانی هەنوکە چالاکی دروستبوونی خەوندایە. ئەم بێتواناییانە بیانوویەکن بۆ دروستکردنی عوساب، ڕێک هەر بەو جۆرەی کە هەر فاکتەرێکی شیاوی تریش دەتوانێت ببێتەهۆی عوساب. کاتێک خاتوونێکی توشبووی عوساب دەڵێت لەبەر ناشیرینیی دەموچاوی و ناقۆلایی لەشی و سەرنجڕاکێشنەبوونیەوە کەس عاشقی نابێت و بەناچاری نەخۆشکەوتووە، ڕەنگە بورووژێین و قسەکانی قبوڵکەین، بەڵام لە «نەخۆش»ـی عوسابگرتووی دواتردا پەی بە خاڵێکی گرنگتر دەبەین چونکە ئەم نەخۆشە تازەیە سەرباری ئەوەی لە ژنانی ئاسایی سەرنجڕاکێشتر دەردەکەوێت و لەڕواڵەتدا زیاتر دەکەوێتە بەر سەرنجی پیاوان، کەچی دیسان هەر تووشی عوساب بووە و لە ئارەزووی سێکسی بێزارە. زۆرینەی ژنانی تووشبووی هیستریا، سەر بە تاقمی ژنە سەرنجڕاکێش و تەنانەت جوانەکانیشن، لەکاتێکدا لەلایەکی ترەوە زۆریی ناشیرینی و کەمئەندامی و تەندروستنەبوون لە چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگادا بڕی نەخۆشکەوتنی عوسابیان تیا بەرزناکاتەوە. پەیوەندیی ڕێزلەخۆگرتن و ئیرۆتیزم (شەهوەتخوازی)، یان بە دەربڕینێکی تر، دەتوانین بەپوختی و بەم جۆرە پەیوەندیی ڕێزلەخۆگرتن و خاڵیبوونەوەی ئۆبێکتی لیبیدۆیی دەربڕین. دەبێت جیاکاری بخەینە نێوان ئەو خاڵیبوونەوە ئیرۆتیکییەی کە ئیگۆدۆستە[٦٣] و ئەو خاڵیبوونەوە دەروونییە

---

٦٣. ego-syntonic: ئیگۆدۆست واتە ئەو ئارەزوو و ئایدیاڵ و حاڵەتانەی

ئیرۆتییەکەشی وا بەپێچەوانەوە تووشی چەپاندن هاتووە. لە حاڵەتی یەکەمدا(واتە ئەو حاڵەتەی کە لە لیبیدۆی ئیگۆدۆستدا خراوەتەگەڕ)، عەشق وەکو باقیی چالاکییەکانی تری ئیگۆ هەڵدەسەنگێنرێت. عاشقبوون خۆی لەخۆیدا، تا ئەو جێیەی پێویستی بە شەیدایی و بێبەشبوونە، ڕێزلەخۆگرتن کەمدەکاتەوە؛ لەکاتێکدا خۆشویستران -واتە بەرامبەرکێبوونی عەشق- و هەبوونی ئۆبێکتی عەشق، جارێکی تر ڕێزلەخۆگرتن بەرزدەکاتەوە. چەپاندنی لیبیدۆ دەبێتەهۆی ئەوەی کە کەسەکە لە شێوەی بەتاڵییەکی توندی ئیگۆدا هەست بە خاڵیبوونەوەی ئیرۆتیکی بکات و عەشق توانای تێرکردنی ئەوی نەبێت. لەم دۆخەدا، بەهێزکردنەوە و دەوڵەمەندکردنەوەی ئیگۆ بەستراوەتەوە بە گەڕاندنەوەی لیبیدۆ لەو ئۆبێکتانەوە [کە ئاراستەیان کراوە]. گەڕانەوەی لیبیدۆ-ئۆبێکت بەرەو ئیگۆ و گۆڕینی ئەو وزەیە بۆ خودئەڤینی، گوزارشتە لە گەڕانەوەی جۆرێک عەشقی شاد و سەرگرتوو. لەلایەکی ترەوە، ئەمەش ڕاستە کە عەشقی سەرگرتوو هەر لەبنەڕەتەوە بەو حاڵەتە دەوترێت کە لیبیدۆ-ئۆبێکت و لیبیدۆ-ئیگۆ لێکجیانەکرێنەوە.

بایەخ و بەرفراوانیی بابەتەکە، هۆیەکی ماقووڵ و پاساودراوە بۆ ئەوەی چەند خاڵێکی تر زیادبکەم-بەبێ ئەوەی پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان بەیەکترەوە هەبێت-.

گەشەی ئیگۆ بەستراوەتەوە بە دەرچوون لە خودئەڤینییە سەرەتاییەکەوە و سەردەکێشێت بۆ هەوڵێکی لێبڕاوانە بۆ گەڕاندنەوەی ئەو دۆخە. ئەم دەرچوونە دەرەنجامی

---

کە دەبنە دۆستی ئیگۆ و ئیگۆ پەسەندیان دەکات- و

جێگۆڕکێی لیبیدۆیە بۆ سەر ئیگۆ *ئایدیاڵێکی*[٦٤] لەدەرەوە سەپێنراو، و هاتنەدیی ئەم ئایدیاڵە بە تێربوون و ڕەزامەندی کۆتاییدێت.

لە هەمان کاتدا، ئیگۆ خاڵیبوونەوەی لیبیدۆیی لە بابەتی ئارەزوودا ئەنجامداوە. هەتا ئەم خاڵیبوونەوەیە زیاتر ببێت ئەوا ئیگۆ لاوازتردەبێت، ڕێک وەکچۆن بەهێزبوونی ئیگۆ *ئایدیال* سەردەکێشێت بۆ لاوازیی ئیگۆ. هەروەها، تێربوون لە بابەتی ئارەزوو —یان بەڕێگەی یەکەم هێنانەدیی ئایدیاڵەکە- توانا دەبەخشێتە ئیگۆ. بەشێک لە ڕێزلەخۆگرتن شتێکی بەرایی و سەرەتاییە، واتە پاشماوەی خودشەیداییەکەی منالییە و بەشێکی تریشی بەرەنجامی ئەو هەمەتواناییەی کە ئەزموون(هاتنەدیی ئیگۆ *ئایدیال*) پشتڕاستیدەکاتەوە. لەکاتێکدا ئەوە تێربوونی لیبیدۆ-ئۆبێکتە وا بەشی سێیەمی ڕێزلەخۆگرتن دەڕەخسێنێت.

ئیگۆ *ئایدیال* ژمارەیەکی زۆر مەرجی قورسی بۆ تێرکردنی لیبیدۆ داناوە لەڕێگەی ئۆبێکتەکانی ئارەزووەوە،

٦٤. ego ideal، پێشتر لە جێی تردا ئەم زاراوەیەمان بە «ئایدیاڵی من» وەرگێڕاوە و دواتر بۆ ئەوەی زاراوەی ئیگۆ وننەبێت کردمان بە "ئیگۆ ئایدیال". ئیگۆ ئایدیال, جۆرێکە لە ئایدیاڵ بۆ ئیگۆ یان بۆ مرۆڤ, ئایدیاڵێکی ڕەمزییە کە لە کۆمەڵگا و پانتاییە ڕەمزییەکەوە وەریدەگرێت و دەیباتە ناو خۆی. ژیژەک دەنوسێت: «ئیگۆ ئایدیال, ئەو کارکەرەیە کە هەوڵ دەدەم نیگا زەقەکەی بخەمە ژێر کاریگەریی وێنەی ئیگۆی خۆمەوە، هەمان ئەویتری گەورە کە دەمخاتە ژێر چاودێرییەوە و ناچارمدەکات دەست لە باشترین شتی خۆم بشۆم، ئەو ئایدیاڵەی کە هەوڵدەدەم بە دوایەوە بم و بیخەمە پراکتیکەوە...سەر بە ڕەمزییە، خاڵی دۆزینەوەی شوناسی ڕەمزیی منە، خاڵێک لە ئەویتری گەورەدا کە بۆ خۆم چاودێری و داوەریی دەکەم». پەیوەندیی ئەم چەمکە بە خودئەڤینییەوە, لەوێوەیە کە لە دەرەوەی ئیگۆوە ئۆبێکتێک دانراوە تا لیبیدۆی لەسەر خاڵیبکرێتەوە, ئەم ئایدیاڵە دەشێت شتی تاک بێت و شتی سەر بە گرووپیش- و

چونکە هەندێ لەو ئۆبێکتانە بە ناتەبا و ناچوونیەک دادەنێت لەگەڵ خۆیدا و لەڕێگەی سانسۆرەوە بەر بە قبوڵکردنیان دەگرێت. لە هەندێ حاڵەتدا کە ئەم ئایدیاڵە درووستنەبووە، بۆیە ئاراستەی سێکسیی ناوبراو بە سیمایەکی نەگۆڕاوەوە لە کەسایەتی‌دا و لە شێوەی لادانی سێکسی‌دا خۆی دەردەخات. ئەوەی مرۆڤەکان بە بەختەوەریی خۆیانی دەزانن، و هەوڵێکی چڕ دەدەن پێی‌بگەن بریتییە لەوەی جارێکی تر ببنەوە بە ئایدیاڵی خۆیان(هەم دەرهەق بە ئاراستە و مەیلە سێکسییەکان و هەم دەرهەق بە ئاراستەکانی تریش)، هەر بەو جۆرەی کە لە منالییشدا وا بوون.

عاشقبوون واتە هەڵقولانی **لیبیدۆ-ئیگۆ** بۆ سەر ئۆبێکتی ئارەزوو. عەشق دەتوانێت چەپاندنەکان لەناوببات و لادانە سێکسییەکان بگەڕێنێتەوە. عەشق، ئۆبێکتی ئارەزوو بۆ ئاستی ئایدیاڵێکی سێکسی بەرزدەکاتەوە. مادام لە عاشقبوونی ئۆبێکتی ئارەزوودا(یان عەشقی پاڵپشتخوازانە) عاشقبوونی کەسەکە بەرەنجامی هاتنەدیی هەلومەرجی منالانەی عاشقبوونە، ئیدی دەتوانین بڵێین هەر فاکتەرێک(یان ئۆبێکتێک) هەڵگری ئەو هەلومەرجە بێت ئایدیالیزە دەبێت.

ڕەنگە ئایدیاڵی سێکسی بچێتە ناو پەیوەندییەکی یاریدەدەر[65]ی سەرنجڕاکێشەوە لەگەڵ *ئیگۆ ئایدیاڵ*دا. هەرکە تێربوونی خودئەڤینی ڕووبەڕووی ئاستەنگی جدی بووەوە، ئیتر دەکرێت ئەم ئایدیاڵە بە مەبەستی تێربوون و لەڕێگەی جێگرتنەوەوە بەکاربهێنرێت. لەو حاڵەتەدا، کەسەکە بەپێی ***هەڵبژاردنەئۆبێکتی*** خودئەڤینانە عەشق دەنوێنێت، عەشق

65. Auxiliary

بۆ پێشووتری خۆی و ئەوەشی کە چیتر نیە-بەدەر لەم حاڵەتەش عەشق بۆ فاکتەری بەرکەوتنی بەو فەزیلەتانەی کە هەرگیز نەیبووە- درووستدەبێت(بەراوردی بکەن بە مۆدیلی **پی** لە بەشی پێشووی ئەم کتێبەدا).

هاوکێشەکە هاوتەریبە بە هاوکێشە ناوبراوەکەی بەشی پێشوو: هەر شتێک ئەو فەزیلەتانەی هەبێت کە ئیگۆ بۆ ئایدیاڵبوونەوە پێویستیەتی، ئەوا خۆشدەویسترێت. ئەم ڕێگەچارەیە بەتایبەت بۆ تووشبووانی عوساب گرنگە، چونکە ئەوان لەبەر خاڵیبوونەوەی زێدەڕۆیانەی دەروونی لە ئۆبێکتی ئارەزوودا ئیگۆیەکی لاوازیان هەیە و ناتوانن ئیگۆ *ئایدیاڵە*کەیان بێننەدی. بۆیە ئەم نەخۆشانە هەوڵدەدەن دەستهەڵگرن لە مەسرەفکردنی دەستبڵاوانەی **لیبیدۆ-ئیگۆ**، و لەوێشەوە خودئەڤینییەکەیان بگەڕێننەوە. بۆ ئەم مەبەستەش، ئایدیاڵێکی سێکسی هەڵدەبژێرن کە لەسەر بنەمای خودئەڤینییەکەیانە و هەڵگری کۆمەڵێک فەزیلەتیشە کە دەستیان پێی ناگات. ئەمە هەر ئەو چارەسەرەیە لەڕێگەی عەشقەوە کە نەخۆشانی ناوبراو لە چارەسەری دەروونشیکارانە بە باشتری دەزانن. لەڕاستیدا، ناتوانن باوەڕ بە هیچ میکانیزمێکی تر بێنن بۆ چارەسەر؛ عادەتەن بەهۆی کۆمەڵێک چاوەڕوانییەوە ڕوودەکەنە چارەسەری دەروونشیکارانە و دەیانەوێت دەروونشیکار ئەو چاوەڕوانییانە بێنێتەدی. بێتوانایی ئەم نەخۆشانە لەمەڕ عاشقبوون -کە لە چەپاندنە زیادەڕۆکانیانەوە سەرچاوەدەگرێت- بەشێوەیەکی سرووشتی دەبێتە ڕێگر لەبەردەم بەرنامەی چارەسەردا. کاتێک نەخۆشەکە بەهۆی چارەسەرەوە بەشێوەیەکی بەشەکی و ڕێژەیی لە چەپاندن

ڕزگاردەبێت، ئیدی بەزۆری ئەنجامێکی نەخوازراوی لێ دەکەوێتەوە: لە درێژەدان بە چارەسەرەکە پاشگەزدەبێتەوە تاکو ئۆبێکتێک بۆ عەشق بدۆزێتەوە و بەم شێوەیە هیوای خۆی بەوەدا هەڵدەواسێت ژیانی هاوبەشی تەک مەعشوقەکەی درێژە بە پرۆسەی چارەسەرکردنەکەی بدات. ئەگەر ئەم بڕیارە، مەترسییە سەرچاوەگرتووەکانی ناو پشتبەستنی ئیفلیجکەری نەخۆشەکەی بۆ یارمەتیدەرەکەی لەگەڵ خۆی نەهێنایە، ئەوا دەکرا بەم دەرەنجامی ڕازی و خۆشنوود بین.

ئیگۆ *ئایدیاڵ* ئامرازێکی گرنگ دەخاتە بەردەستمان بۆ تێگەیشتن لە دەروونناسیی گرووپ[٦٦]. ئەم ئایدیاڵە، سەرەڕای دیوە تاکەکەسییەکەی، دیوێکی کۆمەڵایەتییشی هەیە. بە دەربڕینێکی تر، ئیگۆ *ئایدیاڵ* ئایدیاڵی هاوبەشی خێزانێک، چینێکی کۆمەڵایەتی یان میلەتێکیشە. [ئەم پانتاییەی دەروون] نەک هەر لیبیدۆی خودئەڤینانەی تاکەکەس، بەڵکو بەشێکی گەورەی لیبیدۆ هاوڕەگەزبازییەکەشی کۆتوبەنددەکات-کە بەم جۆرە بەرەو ئیگۆ دەگەڕێنرێتەوە. پێویستیی تێربوون کە لە تێرنەبوونی ئەم ئایدیاڵەوە سەرچاوەدەگرێت، لیبیدۆی هاوڕەگەزبازانە ئازاددەکات و ئەم وزەیە وەردەگەڕێت بۆ هەستی گوناه(دڵەڕاوکێی کۆمەڵایەتی). ئەم هەستی گوناهە لە سەرەتادا بریتیبوو لە ترس لە سزادان بە دەستی باوکودایک، یان بە دەربڕینێکی درووستتر، ترس لەوەی عەشقی ئەوان لەدەستبدەین. دواتر زۆرکەس هەن جێی باوکودایک دەگرنەوە. بەم شێوەیە، باشتر لەوە تێدەگەین کە هێدمە بەر ئیگۆ دەکەوێت یان بێئەمەلی لە تێربوون

66. group psychology

لە پانتایی ئیگۆ *ئایدیاڵدا* ڕوودەدات و دەبێتەهۆی پارانۆیا؛ هەروەها لێخشانی درووستبوونی *ئایدیال* و *بڵندبوونەوە* لە ئیگۆ *ئایدیاڵدا* و ئاڵۆزیی بڵندبوونەوەکانی و گۆڕینی شیمانەیی ئایدیاڵەکانیش لە تێکچوونی پارافرینیدا.

## سەرچاوەی سودلێوەرگیراو بۆ پەراوێزەکان(نوسەر)


Abraham, K. (1908) "Die psychosexuellen Differenzen der Hysterie un der Dementia praecox" Zentbl. Nervenheilk. , N. F. , 19, 521 .

Ferenczi, S. (1913) Review of C. G. Young''s Wandlungen und symbole der Libido (Leipzig and Vienna, 1912), Int. Z. ärztl. Psychoanal. , 1, 391 .

Freud, S. (1911 [1910] "Psycho-Analytic Notes on an Autobiographical Account of a Case of Paranoia (Dementia Paranoides)", Standard Ed. , 12, 3; P. F. L. , 9, 129 .

Jung, C. G. (1911-12) "Wandlungen und symbole der Libido", Jb. Psychoanalyt. Psychopath. Forsch. , 3, 120 and 4, 162; in book form, Leipzig and Vienna, 1912 .

"Versch einer Darstellung der paychoanalytischen Theorie", Jb. Psychoanalyt. Psychopath. Forsch. , 5, 307; in book form, Llipzig and Vienna, 1913 .

# سەرچاوەکانی وەرگێڕان


- پیش‌درآمدی بر خودشیفتگی، نویسنده زیگموند فروید، مترجم، حسین پاینده: پایگاه اطلاع‌رسانی حوزه، ۱۳۸۹.

- Freud, S. (1914). On Narcissism. The Standard Edition of the Complete Psychological Works of Sigmund Freud, Volume XIV (1914-1916): On the History of the Psycho-Analytic Movement, Papers on Metapsychology and Other Works, 67-102

فرۆید لە ساڵی ١٩١٤ ئەم وتارەی نوسیوە. باسی تیۆرەکانی پێش خۆی دەربارەی خودئەڤینی(نەرجسیەت) دەکات و تێڕوانینی خۆیشی بۆ پرسەکە دەخاتەڕوو. فرۆید بەپێی زاراوە و سیستەمی بیرکردنەوەی خۆی ئاوڕ لە پرسی خودئەڤینی دەداتەوە و لەڕیشەوە دیاردەکە شیدەکاتەوە.

**On Narcissism: An Introduction**

---

**sigmund freud**

Translated by: Waleed Omer

